فرەت لە سایەی ئیسلامدا

(٣)

# لەدایک بوونی کچان

# و

## سەرهەڵدانەوەی خەصڵەتێکی سەردەمی نەفامی و جاهلی

### لەسەدەی پێشکەوتووی بیست و یەکدا !!!

قال رسول الله (ﷺ) :

«لا تَكْرَهُوا البَنات ، فإنَّهُنَّ المُؤنسات الغاليات» .


کۆکردنەوە و ئامادەکردنی

مامۆستا محمد عبد الرحمن لطیف



چاپی نۆیەم

ئافرەت لە سایەی ئیسلامدا

(٣)

# لە دایك بوونی کچان

و

سەرهەڵدانەوەی

خەصلەتێکی سەردەمی نەفامی و جاهلی

لە سەدەی پێشکەوتووی بیست و یەکدا !!!


نووسین و ئامادەکردنی

مامۆستا : محمد عبد الرحمن لطیف

بەکالۆریوس لە زانستە شەرعیەکاندا

**ناوی کتێب** : لە دایك بوونی **کچان** و سەرهەڵدانەوەی ...
**ناوی نووسەر** : محمد عبد الرحمن لطیف .
**ژمارەی سپاردن** : ژمارە (٢١٢)ی ساڵی (٢٠٠٦) پێ دراوە لە لایەن وەزارەتی رۆشنبیری حوکومەتی هەرێمی کوردستانەوە .
**زنجیرە** : زنجیرەی (٣) سێیەم لە زنجیرەی ئافرەت لە سایەی ئیسلامدا .
**نۆرە و ساڵی چاپ** : نۆیەم ـ (١٤٣٢ هـ / ٢٠١١) .
**چاپخانە** : چاپەمەنی زانا / سلێمانی .
**بنکەی بڵاوکردنەوە** :

**کتێبخانەی سوننە - سلێمانی .**
**کتێبخانەی پێشین - هەولێر .**
**کتێبخانەی زانستی بەسوود - کەلار .**
**کتێبخانەی سیما - چەمچەماڵ .**

قال الإمام الشافعي رحمهُ الله :

كُلُّ العُلومِ سِوَى القُرآنِ مَشغَلَة إلاّ الحَديثَ وإلاّ الفِقْهَ في الدِّينِ
العِلمُ ما كانَ فيهِ قالَ حَدَّثَنا وما سِوَى ذَاكَ وَسواسُ الشَّياطينِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَارَىٰ مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ ۚ أَيُمْسِكُهُ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ ۗ أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ [سورة النحل] .

وعن عقبة بن عامر وعائشة (رضي الله عنهما) عن النبي (ﷺ) قال :

((لا تَكْرَهُوا البنات ، فإنَّهُنَّ المُؤنسات الغاليات))*

واته : ناحەز و بێزار مەبن لە **كچان** ، چوونكە كچان دڵخۆشكار و سەنگین و خاوەن بەهان .

وقال البيضاوي في تفسير قوله تعالى : **﴿وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى﴾** :

(أي وليس الذكر الذي طلبتِ **كالأنثى** التي وهبتُ ، لعلَّ الأنثى كانت خيراً) .

* سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٣٢٠٦) .

بسم الله الرحمن الرحيم

# دەسپێك

**خوێنەری بەڕێز :**

ئەم زنجیرەیە : (**ئافرەت لە سایەی ئیسلامدا**) چەند بابەتێكی زانستی تێدا دەخرێتە بەر باس و لێكۆڵینەوە سەبارەت بە :

* ئەرك و مافەكانی ئافرەت لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا .
* ڕێز و پلە و پایەی ئافرەتان لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا .
* هەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بە ستەم لێكردن و بەكارهێنانی توندوتیژی دژ بە ئافرەتان .
* وەڵامی ئیسلام و موسڵمانان بۆ ئەو گومان و ڕەخنانەی كە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەگیرێن سەبارەت بە ئافرەتان .
* هەروەها چەندین بابەتی تری زیندوو كە لەم ڕۆژگارەدا بوونەتە بنێشتە خۆشەی سەر زاری چەندین كەسایەتی لە ئیسلام تێنەگەیشتو .

**نووسەر**

**مامۆستا** : محمد عبد الرحمن لطيف

**وتارخوێنی مزگەوتی گوندی حاجیلەر**

**( ١١ / جمادي الأولى / ١٤٢٧ ك )**

**كەلار / كوردستان**

( ٠٧٧٠١٩٨٨٦٢٣ )



## * پێشەکی :

إِنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ .

وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَـــهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ .

أَمَّا بَعْدُ :

فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْثِ كِتَابُ اللهِ وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُـــهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَـــةٍ ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ .

**خوێنەری بەڕێز :**

**منداڵ چ کوڕ بێت یان کچ بەخشیش و نیعمەتێکی خوایە دەیبەخشێت بە باوك و دایك ، بۆیە پێویستە لە سەریان شوکـر و سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگـار بکەن بەرامبەر بەم بەخشیش و میهرەبانی‌یەی خوای گەورە کە پیانی بەخشیوە ، ئەمەش بە بێ جیاوازی کردن لە نێوان کوڕ و کـچ دا چونکە هەردووکیان هەر بەشی خوان .**

بەڵام ـ بە داخـەوە ـ كاتێك چاوێك دەخشێنیت بە لاپەڕەكانی مێژوودا دەبینیت لە سەردەمی جەهالەت و نەفامی پێش هاتنی پێغەمبەری خۆشەویستمان محمد (ﷺ) خەڵكانی گەمژە و دواكەوتووی ئەو سەردەمە كاتێك هەواڵی منداڵی كچیان پێدەدرا ڕوومەتیان **ڕەش** هەڵدەگەڕا و ئەمەیان بە عەیبە و نەنگی و جێی شەرمەزاری دەزانی و پاشان بۆ شاردنەوەی ئەم عەیبەیە (!!!) پەنایان دەبردە بەر زیندەبەچاڵ كردنی كچی دەروون پاكی بێ تاوان و بێ زمان !!!

## * بێباوەڕەكان و حەزنەكردنیان لە كچان :

خوای گەورە ئەم ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە و لە قورئانە پیرۆزەكەیدا فەرموویەتی :

١ ـ ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَارَىٰ مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ ۚ أَيُمْسِكُهُ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ ۗ أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ [سورة النحل] .

واتە : ئەگەر مـژدەی لە دایك بوونـی كـچ بدرییـایەت بە

یەكێك لە بێباوەڕەكان ئەوا ڕوومەتی ڕەش هەڵدەگەڕا لە غەمباری و شەرمەزاریدا و ڕق و قینی خۆیی بەرامبەر بە ژنكەیی دەخواردەوە و خۆی دەشاردەوە لە خەڵك لە خراپێتی ئەو موژدەیەی كە پێی درابوو ئەنجا پەرۆش دەبوو و بیری دەكردەوە ئایا بە شەرمەزاری و سەرشۆڕی بیهێڵێتەوە یان لە ژێر خاكدا زیندەبەچاڵی بكات ، بە ڕاستی ئەمەش خراپ ترین هەڵوێست و بڕیار بوو كە ئەو بێباوەڕانە دەیان نواند و دەریان دەبڕی دەرهەق بە خوا .

قال البيضاوي[1] : (﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ﴾ أُخبِرَ بولادتها ﴿ظَلَّ وَجۡهُهُۥ﴾ صار أو دام النهار كله ﴿مُسۡوَدّٗا﴾ من الكآبة والحياء من الناس ، واسوداد الوجه كناية عن الاغتمام والتشوير ، ﴿وَهُوَ كَظِيمٞ﴾ مملوء غيظا من المرأة ، يستخفي منهم ﴿مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ﴾ : من سوء المبشَّر به عرفا ، ﴿أَيُمۡسِكُهُۥ﴾ مُحدِثاً نفسه متفكرا

---

[1] تێبینییەك : بۆ زانینی ژمارەی ئەو بەرگ و لاپەڕەیەی كە ئەم ووتانەی لێوە وەرگێراوە ئەوا بگەڕێرەوە بۆ سەرچاوەكە بە پێی ناوی سوورەت و ژمارەی ئەو ئایەتانەی كەوا تەفسیرەكەیان لێرەدا باسكرلوە .

في أن يتركه ﴿عَلَىٰ هُونٍ﴾ ذلك ﴿أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ﴾ أي يلقيه فيه ويئده ...) .

واته : مەبەست بە ﴿ئەگەر موژدەى لە دايك بوونى كچ بدرييايەت بە يەكيك لە بێباوەڕەكان﴾ ئەوەيە كە هەواڵى لە دايك بوونى كچيان پىٚ ڕابگەيەنرايەت ، ئەوا ﴿ڕوومەتى﴾ بە درێژاى ڕۆژ ﴿ ڕەش هەڵدەگەڕا﴾ لە غەمبارى و شەرمەزاريدا بەرامبەر بە خەڵك ، وە ڕەش هەڵگەڕانى ڕوومەت دركە و ئاماژەيە بۆ غەمبارى و خەجاڵەت بوون ، ﴿ڕق و قينى خۆيى دەخواردەوە﴾ واتە دڵى پڕ دەبوو لە ڕق و قين بەرامبەر بە ژنكەى ، ﴿خۆى دەشاردەوە لە خەڵك﴾ ﴿ لە بەر خراپى﴾ ئەو موژدەيەى كە پىٚى درابوو ، ﴿بيهێڵێتەوە﴾ مەبەستى ئەوەيە لە گەڵ دەروونى خۆيدا قسەى دەكرد و بيريدەكردەوە ئايا وازى لێبێنێت و بيهێڵێتەوە ﴿بە شەرمەزارى و سەرشۆڕى ﴾ ﴿يان لە ژێر خاكدا زيندەبەچاڵى بكات﴾ .

وقال ابن كثير : (وقوله : ﴿وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ﴾ أي يـــختارون

لأنفسهم الذكور ويأنفون لأنفسهم من البنات التي نسبوها إلى الله تعالى الله عن قولهم علوا كبيرا ، فإنه ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا﴾ أي كئيبا من الهم ، ﴿وَهُوَ كَظِيمٌ﴾ ساكت من شدة ما هو فيه من الحزن ، ﴿ يَتَوَارَىٰ مِنَ الْقَوْمِ﴾ أي يكره أن يراه الناس ﴿مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ ۚ أَيُمْسِكُهُ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ﴾ أي إن أبقاها مهانة لا يورثها ولا يعتني بها ويُفضّل أولاده الذكور عليها ، ﴿أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ﴾ أي يئدها وهو أن يدفنها فيه حية كما كانوا يصنعون في الجاهلية .

واتە : ﴿ئەوەیان هەڵدەبژادر كە حەزیان لێ دەكرد﴾ واتە بۆ خۆیان كوڕانیان هەڵدەبژادر و بێزیان دەهاتەوە و خۆیان دەگرتەوە لەوەی كەوا كچان بۆ ئەوان بێت بەڵكو دەیان دایە پاڵ خوای پایە بەرز لەو ستەمە ، چونكە ئەوان ﴿ئەگەر موژدەی لە دایك بوونی كچ بدرییایەت بە یەكێكیان﴾ ﴿ئەوا ڕوومەتی ڕەش هەڵدەگەڕا﴾ و ڕەنگی هەڵدادەوەری لە غەمباریدا و ﴿ڕق و قینی خۆیی دەخواردەوە﴾ و بێ دەنگ دەبوو لە زۆری ئەو پەژارەیەی كە تێیدا دەبوو و ﴿خۆی

دەشاردەوە لە خەڵك﴾ و حەزی نەدەكرد خەڵك بیبینێت ﴿لە خراپێتی ئەو موژدەیەی كە پێی درا بوو ئەنجا پەرۆش دەبوو و بیری دەكردەوە ئایا بە شەرمەزاری و سەرشۆڕی بیهێڵێەوە یان لە ژێر خاكدا زیندەبەچاڵی بكات﴾ واتە ئەگەر بیهێڵێتەوە ئەوا سەرشۆڕ دەبێت و میراتی بەر ناكەوێت و گرنگی پێنادرێت و كوڕان پێش دەخرێن بە سەریاندا ﴿یان لە ژێر خاكدا زیندەبەچاڵی بكات﴾ واتە بە زیندووی بخرێتە ژێر گڵ و خاكەوە هەروەكو چۆن لە سەردەمی جاهلیەت و نەفامیدا ئەمە ئەنجام دەدرا .

أفمن يكرهونه هذه الكراهة ويأنفون لأنفسهم عنه يجعلونه لله ؟!! ﴿أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ أي بئس ما قالوا وبئس ما قسموا وبئس ما نسبوه إليه كقوله تعالى : ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾﴾ ) .

ئایا ئەوەی كە بۆ خۆیان پیان ناخۆش بوو بەم شێوازە و بێزیان دەهاتەوە و خۆیان دەگرتەوە لەوەی كەوا كچان بۆ ئەوان بێت ئایا ئەمە دەدەنە پاڵ خوای پەروەردگار ؟!!

﴿بە ڕاستی ئەمەش خراپ ترین هەڵوێست و بڕیار بوو کە ئەو بێباوەڕانە دەیان نواند و دەریان دەبڕی دەرهەق بە خوا﴾ واتە ئەمە خراپترین ووتە و خراپترین دابەشکردن و خراپترین شت پاڵدانە بە خواوە هەروەکو چۆن فەرموویەتی : ﴿ ئەگەر موژدەی لە دایك بوونی کچ [کەوا کرا بوو بە نموونەی سووکایەتی بۆ خوای میهرەبان] بدرییایەت بە یەکیك لە بێباوەڕەکان ئەوا ڕوومەتی ڕەش هەڵدەگەڕا و غەمبار دەبوو ﴾ .

وقال أيضاً : (﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾ [النحل] أي من البنات حيث جعلوا الملائكة الذين هم عباد الرحمن إناثاً وجعلوها بنات الله ، وقد كان أحدهم ﴿إِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَارَىٰ مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِي التُّرَابِ ﴾ فهم يأنفون من البنات وجعلوا الملائكة بنات الله فنسبوا إليه ما لا يرتضونه لأنفسهم فهذا أغلظ الكفر) .

واتە : ﴿ئەوە بۆ خوا دادەنێن کە بۆ خۆیان پیان ناخۆشە﴾ واتە لە کچان ، چونکە ئەو بێباوەڕانە فریشتەکانیان بە

ڕەگەزی مێینە دادەنا و بە کچی خواش دایان دەنانن ، بەڵام کەچی دەبینی یەکێك لەو بێباوەڕانە : ﴿ئەگەر موژدەی لە دایك بوونی کچ بدرییایەت بە یەکیك لە بێباوەڕەکان ئەوا ڕوومەتی ڕەش هەڵدەگەڕا لە غەمباری و شەرمەزار بوونی لە ناو خەڵکدا و ڕق و قینی خۆیی بەرامبەر بە ژنکەیی دەخواردەوە و خۆی دەشاردەوە لە خەڵك لە خراپێتی ئەو موژدەیەی کە پێی درابوو ئەنجا پەرۆش دەبوو و بیری دەکردەوە ئایا بە شەرمەزاری و سەرشۆڕی بیهێڵێەوە یان لە ژێر خاکدا زیندەبەچاڵی بکات﴾ ، ئەوان بێزیان دەهاتەوە و خۆیان دەگرتەوە لەوەی کەوا کچان بۆ ئەوان بێت کەچی فریشتەکانیان دەکرد کچ و دایان دەنان بۆ خوا جا ئەوەیان دەدایە پاڵ خوا کە ڕازای نەدەبوون بۆ خۆیان ببێت ، ئەمەش توند ترین جۆری کوفر و بێباوەڕییە .

وقال أيضاً : (أعطوه أخس القسمين [عندهم] من الأولاد وهو البنات وهم لا يرضونها لأنفسهم كما قال : ، وقوله ها هنا ويجعلون لله البنات سبحانه أي عن قولـــهم وإفكهم ﴿أَلَآ إِنَّهُم مِّنۡ إِفۡكِهِمۡ

لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾﴾ [الصافات] ) .

واتە : بێ نرخترین و سووکترینی ئەو دوو بەشە بە لای ئەوانەوەیان دەبەخشی بە خوا لە مندالّەکان کەوا کچان بوون ، ئەو بەشەی کەوا پێی ڕازی نەدەبوون بۆ خۆیان هەروەکو چۆن فەرموویەتی : ﴿ ئایا کوڕان بۆ خۆتان و کچانیش بۆ خوا ئا ئەمە دابەشکردنێکی ستەم کارانەیە﴾ ، وە ئەوەی کە دایان ناوە بۆ خوا لە کچان ! ئەم ووتە و بوهتانە هەڵبستراوە خوا پاك و بەرەیە لێی و بێ کەم کوڕیە و بەریە لەوەی کە مندالّی ببێت ، چونکە ﴿ئەوان لە ووتە بوهتان و هەڵبەستراوەکانیاندا دەیان ووت خوا مندالّی بووە و دروویان دەکرد ، ئایا خوا کچی بۆ خۆی هەڵبژاردووە بە سەر کوڕاندا ، بە ڕاستی ئەمەش خراپ ترین هەڵوێست و بڕیار بوو کە ئەو بێباوەڕانە دەیان نواند و دەریان دەبڕی دەرهەق بە خوا﴾ ، چونکە ئەوان ڕازی نەدەبوون کچان بۆ ئەوان بێت کە چی بۆ خوا دایان دەنان !!!

وقال الطبري : (ولكنهم أضافوا إليه ما يكرهونه لأنفسهم ولا يرضونه لـــها من البنات ما يقتلونـــها إذا كانت لـــهم . . .

**واته : ئه‌و بێباوه‌ڕانه ئه‌وه‌یان ده‌دایه پاڵ خوا كه بۆ خۆیان پێیان ناخۆش بوو و پێی ڕازی نه‌ده‌بوون له‌و كچانه‌ی كه‌وا ده‌یانیان كوشت ئه‌گه‌ر له دایك ببوایه‌ن . . .**

وقوله ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا﴾ يقول وإذا بشر أحد هؤلاء الذين جعلوا لله البنات بولادة ما يضيفه إليه من ذلك له ﴿ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا﴾ من كراهته له ﴿وَهُوَ كَظِيمٌ﴾ يقول قد كظم الـــحزن وامتلأ غَمَّـــاً بولادته له فهو لا يُظهِرُ ذلك . . .

**واته : ﴿ ئه‌گه‌ر مژده‌ی له دایك بوونی كچ بدرییایه‌ت به‌ یه‌كیك لـه بێباوه‌ڕه‌كـان ئـه‌وا ڕوومـه‌تی ڕه‌ش هه‌ڵده‌گـه‌ڕا لـه غه‌مباری و شـه‌رمه‌زاریدا ﴾ مه‌به‌ستی ئه‌وه‌یه ئه‌گـه‌ر یـه‌كێك له‌و بێباوه‌ڕانه‌ی كـه‌وا كـچانیان بـۆ خـوا داده‌نـا مـوژده‌ی لـه دایـك بـوونی كـچیان پـێ بدرییایـه‌ت ئـه‌وا ﴿ ڕوومـه‌تی ڕه‌ش هه‌ڵده‌گه‌ڕا ﴾ چـونكه لـه دایـك بـوونی كـچی پـێناخۆش بـوو ﴿ڕق و قینی خۆیی ده‌خـوارده‌وه﴾ ده‌فـه‌رموێت : دڵ گرانـی**

خۆیی دەشاردەوە و دڵی پڕ لە غەم دەبوو بە لە دایك بوو کچ و ئەم دڵ گرانی و پڕ لە غەمەشی دەرنەدەبڕی بە قسە بەڵکو دەیخواردەوە ...

وعن قتادة قال : وهذا صنيع مشركي العرب أخبرهم الله تعالى ذكره بخُبث صنيعهم ، فأما المؤمن فهو حقيق أنْ يرضى بما قسم الله له ، وقضاءُ الله خيرٌ من قضاء المرء لنفسه ، ولعمري ما يدري أنه خير ! لَرُبَّ جارية خير لأهلها من غلام ، وإنَّما أخبركم الله بصنيعهم لتجتنبوه وتنتهوا عنه ، وكان أحدهم يغذو كلبه ويئد ابنته ...

واتە : ئەمە ڕەفتاری موشریك و هاوەڵبڕیادەرەکانی عەرەبە ، خوای پایە بەرز هەواڵی گەندەڵێتی ئەو ڕەفتارەی پێ ڕاگەیاندن ،

- بەڵام ئیماندار و بڕوادار ئەوا جێی ئەوەیە کە ڕازی ببێت بەوەی کە خوا کردوویەتی بە قسمەتی ،

- وە بڕیاری خوا چاك ترە بۆی لە بڕیاری خۆی ،

- سەرم سوڕماوە ئەو چۆن دەزانێت کوڕ باشترە !!!

- هەندێك جار کچ زۆر لە کوڕ چاك تر و بە فەڕ ترە بۆ کەس و کاری ، بەڵام مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە خوای

پەروەردگار هەواڵی ڕەفتاری ئەوانی داوە بە ئێمە بۆ ئەوەی **دووری لێبگرین و وازی لێبێنین** ، کەسی وا هەبووە لەوانە خواردنی دەدا بە سەگەکەی بەڵام کچەکەی زیندەبەچاڵ دەکرد ...

یقول تعالى ذكره : يتوارى هذا المبشر بولادة الأنثى من الولد له من القوم فيغيب عن أبصارهم من سوء ما بُشِّرَ ... ) .

واتە : ئەو موژدە پێدراوە بە لە دایك بوونی کچ ﴿خۆی دەشارێتەوە﴾ لە خەڵك و خۆی وون دەکات لە پێش چاویان لە خراپێتی ئەو موژدەیەی کە پێی دراوە ...

٢ ـ هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ ﴾ [الزخرف] .

واتە : ئەگەر موژدەی لە دایك بوونی کچ ﴿کەوا کرا بوو بە نموونەی سووکایەتی بۆ خوای میهرەبان﴾ بدرییایەت بە یەکێك لە بێباوەڕەکان ئەوا ڕوومەتی **ڕەش** هەڵدەگەڕا و غەمبار دەبوو .

قال ابن كثير : (جعلوا له من قسمي البنات والبـنين أخـسهما وأردأهما [عندهم] وهو البنات كما قـال تعـالى : ﴿أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَىٰ (٢١) تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰ (٢٢)﴾ [النجم] ... وهذا إنكار عليهم غاية الإنكار ، ثُمَّ ذكر تـمام الإنكار فقال جلت عظمته : ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ (١٧)﴾ أي إذا بشر أحد هؤلاء بـما جعلوا لله من البنات يأنف مـن ذلك غاية الأنفة وتعلوه كآبة من سوء ما بشر به ويتوارى عن القـوم من خجله من ذلك يقول تبارك وتعالى فكيف تأنفون أنتم من ذلـك وتنسبونه إلى الله عز وجل) .

**پێشتر وێنەی ئەم ووتەیە وەرگێڕاوە .**

**٣ ـ خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ الْبَنَاتِ سُبْحَانَهُ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ (٥٧)﴾ [النحل] .**

**واتە : بێباوەڕەكان كچانیان دەدایە پاڵ خوای پاك و بێگەرد و بۆ خۆشیان ئەوەیان هەڵدەبژادر كە حەزیان لێ دەكرد لە كوڕان .**

ئەمەش تەنها لە بەر ئەوە بوو ئەوان زۆر بە چاوێکی سووکەوە سەیری کچانیان دەکرد و زۆریش ڕقیان لە کچ بوو بۆیە دەیان دایە پاڵ خوای گەورە و لە هەمان کاتدا وەك سووکایەتی کردنێکیش بوو بە خوای پاك و بێ کەم و کووڕی !!!

قال ابن كثير : (يقول تعالى منكرا على هؤلاء المشركين في جعلهم لله تعالى البنات سبحانه ﴿وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ﴾ أي من الذكور أي يودون لأنفسهم الجيد ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ﴾ أي يسوؤه ذلك ولا يختار لنفسه إلاّ البنين ، يقول عز وجل فكيف نسبوا إلى الله تعالى القسم الذي لا يختارونه لأنفسهم ، ولهذا قال تعالى : ﴿ فَاسْتَفْتِهِمْ﴾ أي : سَلْهُم على سبيل الإنكار عليهم ﴿أَلِرَبِّكَ الْبَنَاتُ وَلَهُمُ الْبَنُونَ ﴿١٤٩﴾﴾ [الصافات] كقوله عز وجل : ﴿أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰ ﴿٢٢﴾﴾ [النجم] ) .

بەڵام خوای پەروەردگار ئینکاری ئەم هەڵوێست و بڕیارە ستەمکارانەی لێدەکردن و بە خراپترین بڕیار و هەڵوێست

دەیژمارد ، وەك لە ئایەتەكانی سەرەوەدا ڕوون و ئاشكرایە .

هەروەها بە هەمان شێوە لە چەندین ئایەتی تردا خوای گەورە ئینكاری ئەم هەڵوێست و بڕیارە ستەمكارانەی لێكردوون و فەرموویەتی :

﴿ فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ أَلِرَبِّكَ ٱلۡبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلۡبَنُونَ ﴿١٤٩﴾ ﴾ [الصافات] .

﴿ أَصۡطَفَى ٱلۡبَنَاتِ عَلَى ٱلۡبَنِينَ ﴿١٥٣﴾ ﴾ [الصافات] .

﴿ أَمۡ لَهُ ٱلۡبَنَٰتُ وَلَكُمُ ٱلۡبَنُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ [الطور] .

سەرەڕای هەموو ئەم ئایەتانە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ڕاشكاوی دیاردەی (حەز نەكردن لە كچان)ی قەدەغە كردووە ! نەك هەر ئەوەندە بەڵكو (كچان)ی بە دڵخۆشكار و سەنگین و خاوەن بەها ناساندووە :

عن عقبة بن عامر وعائشة (رضي الله عنهما) عن النبي (ﷺ) قال : ((لا تَكْرَهُوا البنات ، فإنَّهُنَّ المُؤنسات الغاليات)) * .

واتە : ناحەز و بێزار مەبن لە كچان ، چوونكە كچان دڵخۆشكار و سەنگین و خاوەن بەهان .

---

* سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٣٢٠٦) .

## * بێباوەڕەكـــان و كوشـــتنی كـــچان و زیندەبەچاڵكردنیان :

بێباوەڕەكان هەڵوێستیان بەرامبەر بە لە دایك بوونی كـچان تەنها ئەوە نەبوو كە ڕوومەتیان ڕەش هەڵبگەڕێت لـە غـەمباری و شەرمەزاریدا كاتێك كە دەیانبیست خێزانـەكانیان كـچیان بـووە ! نـەخێر بەوەشـەوە نەدەوەسـتان بـەڵكو دوای لـە دایـك بوونیـان زیندەبەچاڵیان دەكردن و دەیانكوشتن !

١ ـ خوای گەورە ئەم ڕاستی‌یەمان بـۆ ڕوون دەكاتـەوە و لـە قورئانـــدا فەرموویـــەتی : ﴿وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ ﴿١٣٧﴾﴾ [الأنعام] .

واتە : شەیتانەكانی مرۆڤـ و جنۆكە كوشتنی منداڵە كچەكانیان دەڕازاندەوە بۆ زۆربەی موشریك و هاوەڵبڕیار دەرەكان .

قال ابن كثير : (زيَّـــنَ الشياطين لـــهؤلاء ... وأد البنات خشيةَ العار .. قال مجاهد شركائهم شياطينُهم يأمرونَهم : أنْ يئدوا أولادهم خشية العيلة ، وقال السدي أمرتهم الشياطين أن يقتلوا البنات ...

وهذا كقوله تعالى : ﴿إِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ...﴾ الآية ، وكقولـــه :

﴿أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ۝٢١ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰ ۝٢٢﴾ [النجم] .

واتــە : شــەیتانەكانی مرۆڤــ و جنۆكــە كوشــتنی منداڵــە كــچەكانیان دەڕازانــدەوە بــۆ زۆربــەی هاوەڵبڕیــار دەرەكــان لــە ترســی نــەنگی و عەیبــە و شــەرمەزاریدا ... و زیندەبەچاڵیانیان دەكرد لە ترسی فقیری و هەژاریدا ..

قال ابن منظور : (قال المفسرون : كان الرجل من الجاهلية إذا ولدت له بنت دفنها حين تضعها والدتــها حية مــخافة العار والــحاجة ...)[٢].

واتــە : پیــاوانی ســەردەمی جاهلیــەت و نــەفامی ئەگــەر خێزانەكانیان كــچی ببوایــە ئــەوا زیندەبەچاڵیان دەكــرد ، لــە ترسی شەرمەزاری و بێدارایدا ...

چــونكە ئــەوان باوەڕیــان وابــوو كــەوا كــچ مایــەی شەرمەزارییە بۆ باوك و دایك و پــارە دەرناكات و بەرهــەمی مــادی نییــە ! بۆیــە كــچانیان بــە ئــەرك دەژمــارد بــە ســەر باوكانی دڵ ڕەق و كەودەڵ و كەمژەوە !!!

---

[٢] لسان العرب : (٣ / ٤٤٢) .

٢ ـ هەروەها خوای پەروەردگار فەرموویەتی :

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ ... ﴿١٢﴾﴾ [الممتحنة] .

واتە : ئەی پێغەمبەر ئەگەر ئافرەتان هاتن پەیمانت پێبدەن لە سەر ئەوەی کە بە هیچ شێوەیەك هاوەڵ و شەریك بۆ خوا بڕیار نەدەن و دزی نەکەن و زینا نەکەن و منداڵەکانیان نەکوژن ...

قال المباركفوري : ("وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ " هو ما كانت تفعله الجاهلية من وأد البنات أي دفنهن أحياء لخوف العار والفقر)[٣] .

واتە : مەبەست بە ﴿منداڵەکانیان نەکوژن﴾ ئەوەیە کە خەڵکانی سەردەمی جاهیلیەت و نەفامی دەیانکرد لە زیندەبەچاڵکردنی کچان لە ترسی عەیبە و هەژاری .

٣ ـ هەروەها خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ﴿٨﴾ بِأَىِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ﴿٩﴾﴾ [التكوير] .

---

[٣] تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي : (٩ / ١٤٤) .

واتــه : ئه‌گـه‌ر پرسـیار كـرا لـه زینده‌به‌چـاڵ كـراو : ئایـا به‌رامبه‌ر به چ تاوانێك كوژراوه ؟!

قال ابن منظور : (الـــموؤودة : الـــمدفونة حيةً)[٤].

وقال الشوكانـــي : (ومعنى سُئِلَتْ أنَّ توجيه السؤال إليها لإظهار كمال الغيظ على قاتلها حتـــى كان لا يستحق أنْ يُخاطب ويُسأل عن ذلك ، وفيه تبكيت لقاتلها وتوبيخ له شديد ، قال الـــحسن : أراد اللهُ أنْ يُوبِّخَ قاتلها لأنَّـــها قُتِلَتْ بغير ذنب) .

واتــه : پرسـیاری لێـده‌كرێت مانـای ئه‌وه‌یـه : ڕووبـه‌ڕوو كردنه‌وه‌ی پرسیار بۆ ئـه‌و زینده‌به‌چاڵكراوه مه‌به‌ست پـێ‌ی ده‌رخسـتی ڕق و قـینی خوایـه به‌رامبـه‌ر بـه‌و كه‌سـه‌ی كـه‌وا كوشتویه‌تی ، چـونكه ئـه‌و كه‌سـه كـه ئـه‌و كـرداره‌ی ئـه‌نجام داوه شایـسته‌ی ئـه‌وه نیه‌یـه خـوا قـسه‌ی لـه گـه‌ڵا بكـات و پرسـیاری ئـه‌و تاوانـه‌ی لێبكـات ، وه ئه‌مــه‌ش ده‌م كــوت كردنــه‌وه و سه‌رزنــشتی‌یه‌كی تونـدی تێدایـه بـۆ بكـوژ و زینده‌به‌چاڵكاری ئه‌و كچه بێ تاوانه ...

---

[٤] لسان العرب : (٥ / ٣٨٥) .

**حەسەنی بەصری فەرموویەتی : خوای گەورە مەبەستی ئەوەیە بكوژی ئەو كچە سەرزنشت بكات چونكە بە بێ تاوان كوژراوە .**

وقال ابن الجوزي : (قال اللغويون : الموؤودة البنت تدفن وهي حية ، وكان هذا من فعل الجاهلية ...

قال الزجاج ومعنى سؤالها تبكيت قاتليها في القيامة لأنَّ جوابها قُتِلَتْ بغير ذنب ...)[٥].

**واتە : زیندەبەچاڵ كردنی كچ ڕەفتاری جاهلیەت و نەفامێتیە ...**

وعن المغيرة بن شعبة (ﷺ) قَالَ : ((إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَنْهَى عَنْ وَأْدِ الْبَنَاتِ))[٦].

**واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) زیندەبەچاڵ كردنی كچانی قەدەغە و حەرام كردووە .**

---

[٥] زاد المسير في علم التفسير لابن الجوزي : (٩ / ٤٠) .

[٦] صحيح الأدب المفرد رقم : (٢٧٩) .

*** سه‌رهه‌ڵدانه‌وه‌ی ناڕه‌زایی ده‌ربڕین به‌ له‌ دایك بوونی كچان :**

له‌ پێشه‌وه‌ باسی ئه‌وه‌مان كرد كه‌ خه‌ڵكانی سه‌رده‌می جاهلیه‌ت و نه‌فامی چه‌ند ناڕازی بوون و چه‌ندێك پێیان ناخۆش بوو كچیان ببوایه‌ و له‌ دایك بوونی كچانیان به‌ نه‌نگی و عه‌یبه‌ و شه‌رمه‌زاری له‌ قه‌ڵه‌م ده‌دا !!!

به‌ڵام به‌ داخه‌وه‌ له‌ سه‌ده‌ی پێشكه‌وتن و سه‌ده‌ی بیست و یه‌كه‌دا ! جارێكی تر ئه‌م خه‌صڵه‌ته‌ سته‌مكاری و ڕه‌فتاره‌ دڕندانه‌یه‌ سه‌ریهه‌ڵده‌داته‌وه‌ و لێره‌ و له‌وێ به‌ چه‌ندین شێواز ده‌ربڕینی ناڕه‌زایی ده‌بیستین له‌وانه‌ :

ـ پێش ئاماده‌كردنی ئه‌م نووسراوه‌ به‌ چه‌ند ڕۆژێك موسڵمانێك وتی : من دوێنێ ڕۆیشتم بۆ سه‌ردانی براده‌رێكم كه‌چی بینیم زۆر بێتاقه‌ت و غه‌مبار و ئاڵۆز و بێده‌نگه‌ كه‌ لێم پرسی هۆكاری ئه‌م غه‌مبارییه‌ت چییه‌ ؟ وه‌ڵامی نه‌دامه‌وه‌ .

به‌ڵام دواتر بیستم كه‌وا خێزانه‌كه‌ی كچی بووه‌ و ئه‌میش له‌به‌ر ئه‌وه‌ زۆر غه‌مبار و ئاڵۆز و بێده‌نگ بووه‌ : ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴾ .

ـ هەروەها ئافرەتێك بەسەرهاتی دایکی خۆیی گێڕایەوە و ووتی : من دایکم هەشت کچی لە سەر یەك بوو بوو ، پاش ئەوە سکی نۆیەمی بۆ پەیدا بوو بە چەندین شێواز هەوڵی لە ناو بردنی منداڵەکەیی‌دا لە ترسی ئەوەی نەوەك منداڵی نۆیەمیشی کچ بێت وەکو هەشتەکەی پێشتر !

لەو ڕێگایانەی کەوا دایکم گرتبوویە بەر بۆ لە ناو بردنی منداڵەکەی :

هەندێك جار لە سەروی چەند پلەیەك لە سەر پەیژەوە خۆی هەڵدەدایە خوارەوە بۆ ئەوەی منداڵەکەی فشاری بکەوێتە سەر و جۆلەق ببێت و لەباری بچێت نەوەك ئەمیش کچ بێت !

وە هەندێك جاری تر (بوتڵی غازی گەورەی) دەهێنا و دەیخستە سەر سکی‌یەوە بۆ هەمان مەبەست !

بەڵام ئەوەی کە جێگای سەرسوڕمان بێت لەم بەسەرهاتەدا ئەوەیە کەوا :

ئەو ئافرەتە لە درێژەی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەدا ووتی :
دوای ئەو هەموو هەوڵەی دایکم بۆ لە ناو بردنی منداڵەکەی : ئەو منداڵە هەر مایەوە تاوەکو خۆی بە زیندووی و بە

ئاسایی لە دایك بوو کە چی سەیر دەکەن منداڵەکە کوڕێکی خنجیلانەیە !!!

ـ هەروەها لە خەستەخانەی گشتی کەلار ئافرەتێك لە کاتی عیلاج وەرگرتنندا بە دوکتۆرەیەك دەڵێت : تۆخوا لە کاغەزی مۆنارەکەدا چی نووسراوە کوڕ یان کچ ؟!

دوکتۆرەش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت : نووسراوە منداڵەکەت کچە ، ئەو ئافرەتەش یەکسەر لە جێگەکەی خۆیدا ووشك دەبێت و ماقی دەپەڕێت و ڕووەمەتی ڕەش هەڵدەگەڕێت و بێدەنگ و سەرسام دەبێت !

کە لێی دەپرسنەوە ئەوە بۆ چی وات لێهات ؟

ئەویش دەڵێت : چوار کچم هەیە بۆیە حەزم لە کچ نییە و حەزم لە کوڕە من لە بەر خاتری کوڕ هێشتم سکم پڕ ببێت !!!

ئەنجا یاریدەدەری دوکتۆرە پێی دەڵێت : هەستە بڕۆرە دەرەوە جێگە و کاتمان لێمەگرە یا خوا دوو دوو کچتان ببێت !

ـ هەروەها لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی منداڵبوونی ئافرەتێکی تردا کە پێشتر پێنج کچی هەبووە و منداڵی شەشەمیشی هەر کچ بووە مێردەکەی لە غەمباریدا بۆ ماوەی ڕۆژ و شەوێك دەچێتە

ناو ژوورێكەوە و دەرگا لە خۆی دادەخات و نە نان دەخوات و نە قسەشی لە گەڵ كەسدا كردووە !

وە دواتریش خەسووی ئافرەتەكە ووتویەتی : یا خوا هەر كەسێك دەڵێت ـ خوا لێی نەسێنێت ـ قەبری دەستنەكەوێت ! !

ــ هەندێك لە پیاوان هەڕەشە لە خێزانەكانیان دەكەن بەوەی كەوا ئەگەر كچی ببێت ئەوا پەنا دەباتە بەر خواستنی ژنی دووەم ! ! !

ـ هەندێكی تر لە پیاوان هەڕەشە لە خێزانەكانیان دەكەن بەوەی كەوا ئەگەر كچی ببێت ئەوا دەبێت منالّدانی ببەستێت و ڕێژەی منداڵەكانیان كەم بكەنەوە بۆ ئەوەی ڕێژەی كچان لە ناو خێزانەكەیدا كەم بێت و پەرە نەسێنێت .

ـ پیاوێكی تر وەك هەڕەشەیەك بە خێزانەكەی دەڵێت : ئەگەر (١٥) پانزە كچت ببێت دەبێت هەر منداڵت ببێت تاوەكو كوڕێكت دەبێت .

ـ پیاوێكی تر دوای سك پڕ بوونی خێزانەكەی ووتبووی : من ناوی كوڕم ئامادەكردووە بۆ منداڵەكەمان بەڵام بیرم نەكردووەتەوە لە ناوێك بۆ كچ چونكە من حەزم لە كوڕە و حەزم لە كچ نییە ! ! !

ـ هەندێکی تر دەڵێن : دایکی کوڕ لە کوێ و دایکی کچ لە کوێ ! چونکە دایکی کوڕ ڕێزدار و ناو دارە بەڵام دایکی کچ سەرکز و سەر شۆڕ و شەرمەزارە !!!

ـ هەندێکی تر دەڵێن : ئەو کەسەی کەوا تەنها کچی هەیە وجاخ کوێرە !!!

ئەمانە و چەندین شێوازی تری ناڕەزایی و بێزاری دەربڕین لێرە و لەوێ دەبیستین لە ئاستی لە دایك بوونی کچانی بەڕێزدا .

وە بە ڕاستی ئەم دیاردەیە ـ هەر وەك چۆن لە ناو عەرەبدا هەبووە و هەیە ـ لە کوردەواریشدا زۆر باو بووە و لە پەرەسەندنیشدایە ..

لەم بارەیەوە (قانعی شاعیر) لە ژێر ناونیشانی (ژیانی کچ) لە کوردەواریدا ووتوویەتی :

کچی بەستەزمان دەوری ژیانی
سینەمایەکە ئەگەر بزانـــــی
کە لە دایك بوو ئاهەنگی نییە
ئەڵێن : ئای کچە ! فائیدەی چییە ؟
پیرۆزانەی کەس بۆ ناهێنێ
هیچ کەس بە چاکە هەرگیز نایدوێنێ

پرو پیرەژن دەور دایكی ئەدەن

هەر یەك بە جۆرێ دڵخۆشی ئەكــەن

خەم مەخۆ خوا لە سەر كەرەم بێ

كوڕیــشــت ئەبــێ خاتـرت جەم بـــێ

**چەند وەڵامێك بۆ ئەو جۆرە كەسە جاهیلانە :**

+ ئەم هەڵوێستانە لە بیروباوەڕێكی گەندەڵەوە هەڵـدەقوڵێت چونكە وادیارە ئەو جۆرە پیاوانە وادەزانن و باوەڕیـان وایـە كـەوا ئافرەتان بە ویستی خۆیانە كوڕیان ببێت یان كـچ !

ئەم هەڵوێستە نزیكە لە كوفرەوە چونكە بەخشینی كوڕ یـان كــچ تایبەتـە بـە خـوای پــەروەردگارەوە و بـە هـیچ شـێوەیەك دەستی دایكی تێدا نییە و حەز و ویستیـشی بـە هـیچ شـێوەیەك دەور نابینێت .

خوای گەورە لەم بارەیەوە لە قورئاندا فەرموویەتی :

﴿لِّلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثًا وَيَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ الذُّكُورَ (٤٩) أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا وَيَجْعَلُ مَنْ يَشَاءُ عَقِيمًا إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ (٥٠)﴾ [سورة الشورى] .

واتە : تەنها هی خوایە موڵكی ئاسمانەكانی و زەوی .. دروستی

دەكات ئەوەی كە خۆی ویستی لێیهەبێت .. كچ دەیبەخشێت بە هەر كەسێك كە خۆی ویستی لێیهەبێت و كوڕیش دەیبەخشێت بە هەر كەسێك كە خۆی ویستی لێیهەبێت ، وە یان كوڕ و كچ هەردووكیان پێكەوە دەیبەخشێت بە هەر كەسێك كە خۆی ویستی لێیهەبێت ، وە یان هەر كەسێك كە خۆی ویستی لێیهەبێت نەزۆكی دەكات و بێ منداڵ دەبێت ، بە ڕاستی ئەو خوایە زانا و بە توانایە .

قال ابن كثير : (يخبر تعالى أنه خالق السماوات والأرض ومالكهما والمتصرف فيهما ، وأنه ما شاء كان وما لم يشأ لم يكنْ ، وأنّهُ يعطي مَنْ يشاء ويَمنعُ مَنْ يشاء ولا مانعَ لما أُعطى ولا مُعطِيَ لما منع ، وأنّه ﴿يَخْلُقُ مَا يَشَاء﴾ ، **﴿يَهَبُ لِمَنْ يَشَاء إِنَاثًا﴾** أي يرزقه البنات فقط ومنهم لوط عليه الصلاة والسلام ، **﴿وَيَهَبُ لِمَن يَشَاء الذُّكُورَ﴾** أي يرزقه البنين فقط قال البغوي كإبراهيم الخليل عليه الصلاة والسلام لم يولد له أنثى ، **﴿أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا﴾** أي ويعطي لمن يشاء من الناس الزوجين الذكر والأنثى أي من هذا وهذا قال البغوي كمحمد (ﷺ) ، **﴿وَيَجْعَلُ مَن يَشَاء عَقِيمًا﴾** أي لا يُولد له قال البغوي كيحيى وعيسى عليهما الصلاة والسلام .

فجعل الناس أربعة أقسام :

١ ــ منهم من يعطيه البنات .

٢ ـــ ومنهم من يعطيه البنين .

٣ ـــ ومنهم من يعطيه النوعين ذكوراً وإناثاً .

٤ ـــ ومنهم من يمنعه هذا وهذا فيجعله عقيما لا نسل له ولا ولد له .

إِنَّهُۥ عَلِيمٌ أي بمن يستحق كل قسم من هذه الأقسام ، قَدِيرٌ أي على ما يشاء من تفاوت الناس في ذلك)* .

---

* فائدة : قال ابن كثير في تمام كلامه السابق : (وهذا المقام شبيه بقوله تبارك وتعالى عن عيسى عليه الصلاة والسلام ﴿وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ﴾ أي دلالة لهم على قدرته تعالى وتقدس حيث خلق الخلق على أربعة أقسام : فآدم عليه الصلاة والسلام مخلوق من تراب لا من ذكر ولا أنثى ، وحواء عليها السلام مخلوقة من ذكر بلا انثى ، وسائر الخلق سوى عيسى عليه السلام من ذكر وأنثى ، وعيسى عليه السلام من أنثى بلا ذكر ، فتمت الدلالة بخلق عيسى بن مريم عليهما الصلاة والسلام ، ولهذا قال تعالى : ﴿وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ﴾ فهذا المقام في الآباء ، والمقام الاول في الأبناء ، وكل منهما أربعة أقسام ، فسبحان العليم القدير) .

**واتە : ئەم جێگایە هاوشێوەی فەرموودەی خوای کارپێرەکەت و پایەبەرزە کەوا سەبارەت بە (عیسى عليه السلام) فەرموویەتی : ﴿عیسى دەکەین بە نیشانەیەك بۆ خەڵك﴾ واتە : بەڵگەیەك بێت بۆیان لە سەر دەرخستنی توانای پایەبەرز و پاك وبێگەرد لە هەموو کەموکوڕییەك کەوا مرۆڤەکانی دروست کردووە بە چوار شێواز : (آدم عليه الصلاة والسلام)ی دروست کردووە لە خۆڵوخاك بە بێ نێر و مێ ، وە (حواء عليها السلام)ی دروست کردووە لە نێر بە بێ مێ ، وە هەموو مرۆڤەکانی تری دروست کردووە لە نێر و لە مێ جگە لە پێغەمبەر (عیسى عليه السلام) ، وە (عیسى عليه السلام)ی دەروست کردووە لە مێ بە بێ نێر ، کەواتە : بە دروست کردنی (عیسى عليه السلام) نیشانە و بەڵگە لە**

واتــە : خـوای پایەبـەرز هـەواڵ دەدات كـەوا تـەنها ئـەو ئاسمانـەكان و زەوی دروسـت كـردووە و هــەر خـۆی خـاوەنی هەموویـەتی و گۆڕانكـاری تێـدا ئـەنجام دەدات ، وە ئـەوەی كـە ویستی لێبێت ببێت دەبێت و ئەوەشی كە ویستی لێنـەبێت نابێـت ، وە لـە مـوڵكی خـۆی دەدات بـە هـەر كەسـێك ویـستی لێبێـت و دەشی گرێتەوە لە هەر كەسێكیش خـۆی ویـستی لێبێـت و كـەس ناتوانێـت ڕێگـری بكـات لـەوەی كـە بیـدات و كەسـیش ناتوانێـت شتێك بدات كە ئەو بیگرێتەوە ، وە دروسـتی دەكـات ئـەوەی كـە خۆی ویستی لێیهەبێت ، ﴿كچ دەیبەخشێت بـە هـەر كەسـێك كـە خــۆی ویــستی لێیهــەبێت﴾ واتــە : تــەنها بــەس كـچی پــێ دەیبەخشێت لەوانەش پێغەمبەر (لوط علیه الـصلاة والـسلام) ، ﴿وە كـوڕیش دەیبەخـشێت بـە هـەر كەسـێك كـە خـۆی ویـستی لێیهـەبێت﴾ واتـە : تـەنها بـەس كـوڕی پـێ دەیبەخـشێت وەكـو پێغەمبـەر (إبراهیم علیه الصلاة والـسلام) ، ﴿وە یـان كـوڕ و كـچ

---

سـەر كـامڵێتی توانـای خـوا بـە تـەواوی هاتووەتـە دی ، بۆیـە خـوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿عیـسی دەكـەین بـە نیـشانەیەك بـۆ خـەڵك﴾ ئەمـە جێگایەكـە سـەبارەت بـە باوكـان ، وە جێگـای یەكـەمیش سـەبارەت بـە منـداڵان ، وە هـەر یەكێكیانیش لە چوار بەش پێكهاتبوو ، جا پاكی بۆ خوای زانا و بە توانا .

هـەردووكيان پێكـەوە دەيبەخـشێت بـە هـەر كەسێك كـە خـۆ
ويـستی لێيهـەبێت﴾ واتـە : كـوڕ و كـچ هـەردووكيان پێكـە
دەيبەخشێت بە هەر كەسێك كە خۆی ويستی لێيهەبێت لە خـە
واتە لەمەش و لەوەش وەكو پێغەمبەر (محمد ﷺ) ، ﴿وە يان هـ
كەسێك كە خۆی ويستی لێيهـەبێت نـەزۆكی دەكات و بـێ منـد
دەبێت﴾ واتـە : منـداڵی نابێـت وەكـو هـەردوو پێغەمبـەر (يحـ
وعيسى عليهما الصلاة والسلام).

كەواتە خەڵكی كردووەتە چوار بەشەوە :

١ ـ هەندێكان تەنها كچی پێدەدات .

٢ ـ وە هەندێكی تريان تەنها كوڕيان پێدەدات .

٣ ـ وە هەندێكی تريان لە هەردوو جۆرەكەيان پێدەدات نێ
و مێيش .

٤ ـ وە هەندێكی تريـان ئەمـەش و ئەوەشـی لێدەگرێتـەوە
دەيكات بە نەزۆك و نە وەچەی دەبێت و نە منداڵ .

﴿خـوا زانايـە﴾ واتـە : بـەو كەسـەی كـەوا شايـستەی هـ
بەشێك بێت لەم بەشانە ، ﴿بە توانايە﴾ واتـە : بـە سـەر ئـەوە
كە ويستی لێبێت لە جياوازی نێوان خەڵكدا لەو شتەدا .

*** ئایا دایك هیچ ڕۆڵێكی هەیە لەوەدا كەوا منداڵەكەی كوڕ بێت یان كچ ؟**

بە پێی ئەو ئایەتانەی سەرەوە بەخشینی كچ یان كوڕ یان هەردووكیان پێكەوە یان نە بەخشینی هیچ كامێكیان تەنها لە ویستی خوای پەروەردگار دایە و بە پێی توانای ئەو دەبێت و ویستی باوك و دایك هیچ ڕۆڵێكی نیيە لە دیاری و دەستنیشان كردنی ڕەگەزی منداڵدا كەوا نێر بێت یان مێ !

لە گەڵ ئەوەشدا بە هۆی پێشكەوتنە زانستیيەكانەوە لەم سەردەمەدا ئەوە سەلمێنراوە كەوا بە هیچ جۆرێك دایك هیچ ڕۆڵێكی نیيە لەوەدا كەوا منداڵەكەی كوڕ بێت یان كچ بەڵكو بە پێچەوانەوە ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ لای باوك !

ئەمەش بەم شێوازەی خوارەوە ڕوون دەكەینەوە :

بێ گومان دروست بوونی منداڵ لە ناو منداڵدانی دایكدا سەرچاوەدەگرێت لە بە یەكگەیشتن و پیتاندن و یەكگرتنی (تۆوی پیاو / النطفة) لە گەڵ (تۆوی ئافرەتدا / البويضة) وەك لەم ئایەتانەدا باس كراوە :

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ۝٥ خُلِقَ مِن

﴿مَّآءٍ دَافِقٍ ٦ يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ ٧﴾ [سورة الطارق] .

واته : با مرۆڤ بڕوانێت بۆ ئەوەی بزانێت لە چی دروست كراوە ؟ لە ئاوێكی هەڵقڵاوەوە دروست كراوە كە لە نێوان پشتی پیاو و سنگی ئافرەتەوە دەردەچێت و هەڵدەقوڵێت .

قال ابن كثير : (قوله : ﴿خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ﴾ يعني المَني : يخرج دَفقاً من الرجل ومن المرأة ، فيتولَّدُ منهما الولدُ بإذن الله عزَّ وجل ولهذا قال : ﴿يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ﴾ يعني : صُلب الرَّجل وترائب المرأة وهو صَدرها) .

هەروەها لەم بارەیەوە فەرموویەتی : ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ ... ٢﴾ [سورة الإنسان] .

واتە : ئێمە مرۆڤمان دروست كردووە لە ئاوێكی تێكەڵ (ئاوی پیاو و ئاوی ئافرەت) ...

قال ابن عباس في قوله : ﴿نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ﴾ (يعني ماءَ الرجل وماءَ المرأة إذا اجتمعا واختلطا ...

وهكذا قال عكرمة ومجاهد والحسن والربيع بن أنس : الأمشاج هو اختلاط ماء الرجل بماء المرأة)*.

---

* تفسير ابن كثير .

واتە : مرۆڤـ دروست دەبێت لە ئەنجامی تێكەڵ بوونی ئاوی پیاو لە گەڵ ئاوی ئافرەتدا .

بە پێی زانستی سەردەم (تۆوی پیاو / النطفة أو الحيوان المنوي أو الحوين) هەروەها (تۆوی ئافرەتیش / البويضة) بە هەمان شێوە خانەیەكی تێدایە كە پێكهاتووە لە (٢٣) كرۆمۆسۆم ، جا لە كاتی بەیەككەیشتنی (تۆوی پیاو و تۆوی ئافرەت) ناوك (نَواة)ی هەردووكیان یەكدەگرن و خانەیەك پێك دێنن ، ناوكی ئەو خانەیەیش (٤٦) كرۆمۆسۆمی تێدایە .

دوو (٢) كرۆمۆسۆم لە نێوان ئەو (٤٦) كرۆمۆسۆمەدا ـ كە دانەیەكیان هی پیاوەكەیە و دووەمیشیان هی ژنەكەیە ـ ئەركی دیاری و دەستنیشان كردنی جۆری ڕەگەزی ئەو منداڵەیان لە ئەستۆدایە كەوا لێیەوە دروست دەبێت .

كرۆمۆسۆمی یەكەمیان هی پیاوەكەیە كە ئەویش دەبێت بە دوو بەشەوە :

یەكەم : كەوا هێمای پیتی (Y) زمانی ئینگلیزی بۆ دانراوە و هێمایە بۆ ئەوەی كەوا ڕەگەزی منداڵكە نێر (واتە : كوڕ) دەبێت ئەگەر ئەمەیان لە گەڵ كرۆمۆسۆمی ئافرەتەكەدا یەكبگرێت .

دووەم : كەوا هێماى پيتى (X) زمانى ئينگليزى بۆ دانراوە و هێمايە بۆ ئەوەى كەوا ڕەگەزى منداڵكە مێ (واتە : كـچ) دەبێـت ئەگەر ئەمەيان لە گەڵ كرۆمۆسۆمى ئافرەتەكەدا يەكبگرێت .

بەلاَم كرۆمۆسۆمى دووەميان هـى ئافرەتەكەيـە كـە ئـەويش دەبێت بە دوو بەشەوە :

يەكـەم و دووەم : كـەوا هـەردووكيان هێمـاى پـيتى (X) زمـانى ئينگليزى بۆ دانراوە و هێمايە بۆ ئـەوەى كـەوا ڕەگـەزى منداڵكـە مـێ (واتە : كـچ) دەبێت .

واتە كرۆمۆسۆمى پياو بريتىيە لە (X.Y) .

بەلاَم كرۆمۆسۆمى ئافرەت بريتىيە لە (X.X) .

جا لـە كـاتى پيتانـدن و يەككرتنـدا كرۆمۆسـۆمى دياريكـار و دەسنيشانكارى ڕەگەزى منداڵى پياوەكە و ئافرەتەكەيش دەبێـت بە دوو بەشەوە :

هـى پياوەكـە يـان دەبێـت بـە (Y) كـەوا هێمايـە بـۆ ئـەوەى منداڵەكە نێرە و كوڕە .

وە يان دەبێت بە (X) كەوا هێمايە بۆ ئەوەى منداڵەكە مێيە و كچە .

هى ئافـرەتەكـەيش هــەردوو بەشەكەى هـەر (X)ـە ، واتە :

(X.X) دەبێت كەوا هێمایە بۆ ئەوەی منداڵەكە مێیە و كچە .

كەواتــە ئەگــەر بەشــی (Y) كرۆمۆســۆمی پیاوەكــە لــە گــەڵ بەشی (X) كرۆمۆسۆمی ژنەكەی گەیشتن بەیـەك و یـەكیان گـرت ئەوا منداڵەكەیان نێر و كوڕ دەبێت .

وە ئەگەر بەشی (X) كرۆمۆسـۆمی پیاوەكـە لـە گـەڵ بەشـی (X) كرۆمۆسـۆمی ژنەكـەی گەیـشتن بەیـەك و یـەكیان گـرت ئـەوا منداڵەكەیان مێ و كچ دەبێت .

دەرئـەنجام ئـەوەمان بـۆ دەردەكـەوێت كـەوا دایـك بـە هـیچ جۆرێـك ڕۆڵـی لـەوەدا نـیـە كـەوا منداڵەكـەی كـوڕ بێـت چـونكە كرۆمۆسۆمەكەی (X.X)ــە .

بەڵكو ئەمـە دەگەڕێتـەوە بـۆ لای ئـەو بەشـە كرۆمۆسـۆمەی باوك كەوا منداڵی پێ دروست دەبێت ، جا ئەگـەر بـە بەشـی (Y) بەشداری كرد ئـەوا منداڵـەیان كـوڕ دەبێـت ، وە بـە پێـچەوانەوە ئەگەر بە بەشی (X) بەشداری كرد ئەوا منداڵەیان كـچ دەبێت .

بێ گومان ئەمەش بە پێی ویستی پیـاو نـیـە و لـە توانـای پیاویشدا نیە كامیانی بە دڵە ئەوەیان هەڵبژێرێت ! بەڵكو ئەمـە تەنها بە پێی ویستی خوایە و تەنها لە توانای ئەودایە .

كەواتـە بـا بـە هـیچ جۆرێـك پیـاوان گازنـدە و گلـەیی لـە ژنەكانیان نەكەن ئەگەر تەنها منداڵی كچیان بـوو ! چـونكە ئەمـە بە هیچ جۆرێك ڕۆڵی دایكی تێدا نییە !

بەڵكو بە پێچەوانەوە ـ بە مەرجێك ئەگەر دروست و شەرعی بوایە ، كە واش نییـە ـ لـەو كاتـەدا ئەبوایە ئافرەتـان گازنـدە و گلەییان لە مێردەكانیان بكردایە ! چـونكە ئـەوان ڕۆڵیـان لـەوەدا هەیە كەوا منداڵەكەیان كوڕ بێت یان كچ !

بەڵام ئەمەش دروست نییە و نا شەرعییە ، چونكە پیـاویش لە دەست و ویست و ئارەزووی خۆیدا نییـە كـەوا بـە بەشـی (Y) بەشداری بكات بۆ ئەوەی منداڵەكەیان كوڕ بێت نەك كـچ * ! ! !

دانەری كتێبی : (الوراثة والاستنساخ) دەڵێت : (عند الإخصاب إذا التقى كروموسوم الرجل الـجنسي من نوع (X) مـع كروموسـوم

---

* بۆ ئەم زانیاریانە زیاتر سود لەم سەرچاوانە بینراوە : (دراسات فقهية فـي قـضايا طبيـة معاصرة) (٢ / ٦٤٧ ــ ٦٨٥) بحث بعنوان : (عمليات التنسيل وأحكامها الشرعية) و بحث آخر بعنوان : (الـهندسة الوراثية من الـمنظور الشرعي) : (٢ / ٦٨٧ ــ ٧٣١) كلاهـما للدكتور عبد الناصر أبو الـبصل ، و سلسلة ومضات إعجازية من القرآن والسنة النبويـة ــ الكتاب الـحادي عشر بعنوان : (الوراثة والاستنساخ) للدكتور الـمهندس خالد العبيدي ص : (١٢ ــ ١٤) (تحديد جنس الـجنين ، و الكروموسومات) .

المرأة الثابت دائماً (X) لتكوين الناتج (X.X) فنتيجة الحمل تكون أنثى ، أمَّا إذا كان كروموسوم الرجل من النوع الآخر أي (y) فالناتج يكون (X.y) فنتيجة الحمل يكون ذكر ، أي إنَّ المرأة المسكينة لا دخل لها بالموضوع برمته) .

**واته : له كاتی پیتاندن و به یەكگەیشتنی ئاوی پیاو و ئاوی ئافرەتدا ئەگەر كۆمۆسۆمی ڕەگەزی پیاو له جۆری (X) له گەڵ كرمۆسۆمی ڕەگەزی ئافرەتدا كه هەمیشه و بەردەوام له جۆری (X)ـه گەیشتن به یەك ئەوا دەرئەنجامەكه (X.X)ـه كەواته دەرئەنجامی ئەو (سكپڕییه) مێ دەبێت ، بەڵام ئەگەر كۆمۆسۆمی ڕەگەزی پیاو له جۆرەكەی تر بوو واته (y) ئەوا دەرئەنجامەكه (X.y)یه كەواته دەرئەنجامی ئەو (سكپڕییه) نێر دەبێت ، واته ئافرەتی داماو هیچ ڕۆڵێكی لەم مەسەلەیەدا نییه به هیچ جۆرێك .**

ئەنجا دوای ئەمه دەڵێت : (والقرآن صرَّح بهذه الحقيقة .. بقوله تعالى :

**﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطۡفَةٍ إِذَا تُمۡنَىٰ ﴿٤٦﴾﴾**

[سورة النجم] ، وقوله تعالى : **﴿أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾ أَلَمۡ يَكُ**

نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴿٣٩﴾﴾ [سورة القيامة] .

ففي الآية الأولى ذكر أنَّ الـجنسين يتحددان من النطفة الذكرية فهي التي تُمنى ، وفي الأية الثانية توضيح أنَّهُ من مَني الذكر ـ فالهاء في ﴿مِنْهُ﴾ تعود على مني الذكر ـ يكون الـجنسين الذكر والأنثى ، فسبحان الله)* .

واتە : قورئان بە ڕوونی باسی ئەم ڕاستییەی كردووە .. بە ئایەتی : ﴿خوا ھەردوو ڕەگەزی نێر و مێی دروست كردووە ، لە ئاوی پیاو كاتێك پێدەگات﴾ وە بە ئایەتی : ﴿ئایا مرۆڤ وادەزانێت وازی لێدەھێنرێت و لێپرسینەوەی لە گەڵدا ناكرێت ، ئایا مرۆڤ ئاوی پیاو نەبوو لە ئاوێك كە پێدەگات ، لە ئاوی پیاو ھەردوو ڕەگەزی نێر و مێی دروست كردووە﴾ لە ئایەتی یەكەمدا باسی ئەوەی كردووە كە ھەردوو ڕەگەزەكە دیاری دەكرێن لە ئاوی نێرینە (پیاو) چونكە ئەوەیان پێدەگات و گەشەدەكات ، وە لە ئایەتی دووەمدا ئەوەی ڕوون كردووەتەوە كەوا لە ئاوی نێرینە ـ چونكە ڕاناوی (ھـ) لە ﴿مِنْهُ﴾ دەگەڕێتەوە بۆ ئاوی

---

* الوراثة والاستنساخ : (١٣ ــ ١٤) .

نێرینە - هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ دروست دەبێت ، پاکی و بێگەردی بۆ خوا .

*** هەندێك زانیاری وردتر لەم بارەیەوە :**

ئیمامی (القرطبي) لە ژێر ڕۆشنایی دوو فەرموودەدا وتەیەکی زانستی بە هێزمان بۆ دەگێڕێتەوە لە ئیمامی (ابن العربي)ەوە : (قال النبي ﷺ : ((إِذَا سَبَقَ مَاءُ الرَّجُلِ مَاءَ الْمَرْأَةِ أَذْكَرَا ، وَإِذَا سَبَقَ مَاءُ الْمَرْأَةِ مَاءَ الرَّجُلِ آنَثَا)) .

واتە : ئەگەر ئاوی پیاو پێش ئاوی ئافرەت کەوت ئەوا منداڵەکەیان نێر دەبێت ، وە ئەگەر ئاوی ئافرەت پێش ئاوی پیاو کەوت ئەوا منداڵەکەیان مێ دەبێت .

وكذلك في الصحيح أيضا : ((إِذَا عَلاَ مَاءُ الرَّجُلِ مَاءَ الْمَرْأَةِ أَشْبَهَ الْوَلَدُ أَعْمَامَهُ ، وَإِذَا عَلاَ مَاءُ الْمَرْأَةِ مَاءَ الرَّجُلِ أَشْبَهَ الْوَلَدُ أَخْوَالَهُ)) .

واتە : ئەگەر ئاوی پیاو سەرکەوت بە سەر ئاوی ئافرەتدا ئەوا منداڵەکە شێوەی دەچێتە سەر مامەکانی ، وە ئەگەر ئاوی ئافرەت سەرکەوت بە سەر ئاوی پیاودا ئەوا منداڵەکە شێوەی دەچێتە سەر خاڵۆکانی .

قلت : هذا معنى حديث عائشة لا لفظه ، خرجه مسلم من

حديث عروة بن الزبير عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) : ((أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) : هَلْ تَغْتَسِلُ الْمَرْأَةُ إِذَا احْتَلَمَتْ وَأَبْصَرَتِ الْمَاءَ ؟ قَالَ : نَعَمْ ، فَقَالَتْ لَهَا عَائِشَةُ : تَرِبَتْ يَدَاكِ وَأُلَّتْ ، وَهَلْ تَرَى الْمَرْأَةُ ذَلِكَ ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : دَعِيهَا وَهَلْ يَكُونُ الشَّبَهُ إِلاَّ مِنْ قِبَلِ ذَلِكَ ؟ إِذَا عَلاَ مَاؤُهَا مَاءَ الرَّجُلِ أَشْبَهَ الْوَلَدُ أَخْوَالَهُ ، وَإِذَا عَلاَ مَاءُ الرَّجُلِ مَاءَهَا أَشْبَهَ أَعْمَامَهُ)) ...

واتە : دەڵێم : ئەمە واتای فەرموودەكەی (عائشة)یە نەك (لفظ)ەكی ، ئیمامی (مسلم) دەیگێڕێتەوە لە فەرموودەی (عروة بن الزبير)ەوە كەوا ئافرەتێك وتی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) : ئایا ئافرەت خۆی بشوات ئەگەر لە خەودا لەش گران (ئیحتیلام) بوو و ئاوی بینی ؟ فەرمووی : بەڵێ ، عائیشە هاواری كرد لەو ئافرەتە و پێی وت : ئەی دەستت بچێت بە خۆڵدا ، ئایا ئافرەت ئەوە دەبینێت ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : وازی لێبێنێ ئایا لێچوون دەبێت ئیللا لەم ڕێگەیەوە نەبێت ؟ ئەگەر ئاوی ئافرەت سەر كەوت بە سەر ئاوی پیاودا ئەوا منداڵەكە شێوەی دەچێتە سەر خاڵۆكانی ، وە ئەگەر ئاوی پیاو سەركەوت بە سەر ئاوی ئافرەتدا ئەوا منداڵەكە شێوەی دەچێتە سەر مامەكانی.

وقد بنـــى القاضي أبو بكر بن العربي على هذه الآحاديث بناء فقال :

إنّ للماءين أربعة أحوال :

الأول : أنْ يخرج ماء الرجل أولا ،

الثاني : أنْ يخرج ماء المرأة أولا ،

الثالث : أنْ يخرج ماء الرجل أولا ويكون أكثر ،

الرابع : أنْ يخرج ماء المرأة أولا ويكون أكثر ،

**واته : (القاضي أبو بكر بن العربـــي) له سەر ئەم فەرموودانـە بینایەكی بنیات ناوە و فەرموویەتی :**

**بەڕاستی ئاوی پیاو و ئافرەت چوار حاڵەتی هەیە :**

**یەكەم : یەكەمجار ئاوی پیاوەكە دەربچێتە دەرەوە ،**

**دووەم : یەكەمجار ئاوی ئافرەتەكە دەربچێتە دەرەوە ،**

**ســێیەم : یەكــەمجار ئــاوی پیاوەكــە دەربــچێتە دەرەوە و زیاتریش بێت ،**

**چــوارم : یەكــەمجار ئــاوی ئافرەتەكــە دەربــچێتە دەرەوە و زیاتریش بێت ،**

ويتم التقسيم بأنْ يخرج ماء الرجل أولا ثم يخرج ماء المرأة بعـــده ويكون أكثر أو بالعكس :

**واته : دابەشكردنەكە بەوە دەبێت كەوا یەكەمجار ئاوی پیاو**

دەربچێتە دەرەوە ئەنجا دوای ئەوە ئاوی ئافرەت دەربچێتە دەرەوە و زیاتریش بێت یان بە پێچەوانەوە :

فإذا خرج ماء الرجل أولا وكان أكثر جاء الولد ذكرا بحكم السبق وأشبه الولد أعمامه بحكم الكثرة .

جا ئەگەر یەكەمجار ئاوی پیاوەكە دەربچێتە دەرەوە و زیاتریش بێت ئەوا منداڵەكە نێر دەبێت بە حوكمی پێشدەرچوون و منداڵەكەش شێوەی دەچێتە سەر مامەكانی بە حوكمی زۆرێتی ئاوەی پیاوەكە .

وإن خرج ماء المرأة أولا وكان أكثر جاء الولد أنثى بحكم السبق وأشبه أخواله بحكم الغلبة .

وە ئەگەر یەكەمجار ئاوی ئافرەتەكە دەربچێتە دەرەوە و زیاتریش بێت ئەوا منداڵەكە مێ دەبێت بە حوكمی پێشدەرچوون و منداڵەكەش شێوەی دەچێتە سەر خاڵۆكانی بە حوكمی زۆرێتی ئاوەی ئافرەتەكە و سەركەوتنی بە سەر ئاوی پیاوەكەدا .

وإن خرج ماء الرجل أولا لكن لما خرج ماء المرأة بعده كان أكثر كان الولد ذكرا بحكم السبق وأشبه أخواله بحكم غلبة ماء المرأة .

وە ئەگەر یەكەمجار ئاوی پیاوەكە دەربچێتە دەرەوە بەڵام كاتێك لە دوایەوە ئاوی ئافرەتەكە دەردەچێتە دەرەوە و زیاتر

دەبێت ئەوا منداڵەکە نێر دەبێت بە حوکمی پێشدەرچوون و منداڵەکەش شێوەی دەچێتە سەر خاڵۆکانی بە حوکمی زۆرێتی ئاوەی ئافرەتەکە سەرکەوتنی بە سەر ئاوی پیاوەکەدا .

وإن سبق ماء المرأة لكن لما خرج ماء الرجل كان أعلى من ماء المرأة كان الولد أنثى بحكم سبق ماء المرأة وأشبه أعمامه بحكم غلبة ماء الرجل .

وە ئەگەر لە پێشدا ئاوی ئافرەتەکە دەرچووە دەرەوە بەڵام کاتێك ئاوی پیاوەکە لە دوایەوە دەردەچێتە دەرەوە و زیاتر دەبێت لە ئاوی ئافرەتەکە و سەردەکەوێت بە سەریدا ئەوا منداڵەکە مێ دەبێت بە حوکمی پێش دەرچوونی ئاوی ئافرەتەکە و شێوەشی دەچێتە سەر مامەکانی بە حوکمی زۆرێتی و سەرکەوتنی ئاوی پیاوەکە بە سەر ئاوی ئافرەتەکەدا .

قال : وبانتظام هذه الأقسام يستتب الكلام ويرتفع التعارض عن الأحاديث ، فسبحان الخالق العليم)* .

واتە : ـ لە کۆتاییدا فەرموویەتی ـ : بە ڕێکخستنی ئەم بەشانە ووتەکان یەکدەگرنەوە و نەسازی نێوان فەرموودەکان هەڵدەگیرێت ، پاکی و بێگەردی بۆ خوای بەدیهێنەر و زانا .

---

* تفسير القرطبي : (١٦ / ٥٠) .

+ هەروەها له ڕاستیدا ئەو جۆره كەسانه گەمژه و جاهیل و نەفام و دواكەتوون و نازانن چەندین كچی شكۆدار و پایه بەرز و هەڵكەوتوو هەیه كه له ناو لاپەڕەكانی مێژوودا جێگای دیاری كراو و سەنگی خۆیان هەیه ، لەوانه :

١ ـ خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) .

٢ ـ فاطیمەی كچی پێغەمبەر (ﷺ) .

٣ ـ مەریەمی كچی عیمرانی دایكی پێغەمبەر عیسا (عليه السلام) .

٤ ـ ئاسیای كچی موزاحیمی خێزانی فیرعەون .

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) :

((أَفْضَلُ نِسَاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ : خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِد ، وَفَاطِمَةُ بِنْتُ مُحَمَّدٍ ، وَمَرْيَمُ ابْنَةُ عِمْرَانَ ، وَآسِيَةُ بِنْتُ مُزَاحِمٍ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ))[٧] .

واته : باشترین ئافرەتانی بەهەشت بریتین له : خەدیجەی كچی خوەیلد و فاطیمەی كچی موحەمەد و مەریەمی كچی عیمران و ئاسیای كچی موزاحمی خێزانی فیرعەون .

٥ ـ هەروەها عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) كه زانا ترین ئافرەتی دونیایه و یەكێكه له سەرچاوەكانی گێڕانەوەی

---

[٧] صحيح الجامع الصغير رقم : (١١٣٥) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (١٥٠٨) .

فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) .

هەروەها چندین ئافرەتی بە ناوبانگ و شکۆداری تریش کە لە مێژوودا جێ دەستیان دیارە .

+ وە ئەوانەی کە دەڵێن : ئەو کەسەی کەوا تەنها کچی هەیە وجاخ کوێرە ! ! !

دەبێت بڵێن : پێغەمبەریش (ﷺ) وجاخ کوێرە ! چونکە پێغەمبەر (ﷺ) هەموو منداڵەکانی کچ بوون تەنها ئیبراهی کوڕی نەبێت کە هەر لە منداڵیەوە مرد .

ئەمەش وتەی بێباوەڕەکانە کە دەیان وت : پێغەمبەر (ﷺ) وجاخ کوێرە چونکە تەنها کچی هەیە و کوڕی نییە !

خوای گەورەش لە وەڵامیاندا فەرمووی : ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ ۝٣﴾ [سورة الكوثر] .

واتە : ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ناحەزانی تۆ وجاخ کوێرن .

+ وە ئەوانەی کە دەڵێن : دایکی کوڕ لە کوێ و دایکی کچ لە کوێ ! چونکە دایکی کوڕ ڕێزدار و ناو دارە بەڵام دایکی کچ سەر کز و سەر شۆڕ و شەرمەزارە ! ! !

ئەمانە بەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز وەڵامیان دەدینەوە کە

خوای گەورە تێیاندا باسی بە سەرهاتی دایكی مەریەم دەكات و فەرموویەتی : ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ ۖ وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾ ﴾ [سورة آل عمران] .

واتە : خێزانەكەی عیمران ووتی : پەروەردگارم من ئەوەی كە لە سكمدایە كردووەمە بە نەزر بۆ تۆ بۆ خزمەت كردنی مزگەوت ، خوایە لێمی وەربگرە ، خوایە تۆ بیسەر و زانایت ، ئەنجا كە لە دایك بوو ووتی : پەروەردگارم منداڵەك كچە ﴿مەبەستیش ئەوەیە كچ ناگونجێت بۆ خزمەت كردنی مزگەوت﴾ ، خواش دەزانێت چی بووە ، وە كوڕ وەكو كچ نییە و من ناوم ناوە (مەریەم) و پەنام داوە بە خوا لە شەیتانی دەركراو لە ڕەحمەتی خوا ، ئەنجا خوای پەروەردگار بە باشترین شێوە وەریگرت لێی و

بەرهەمەمێكی پاشی لێدەرهێنا و سەرپەرشتیاری دایە دەست پێغەمبەر (زەكەریا) ، جا هەر كاتێك پێغەمبەر (زەكەریا) بڕۆیشتایەتە ژوورەوە بۆ لای پەرستگاكەی هەندێك خواردن و میوەی دەبینی و دەیفەرموو : ئەی مەریەم ئەمەت لە كوێ هێنا و چۆن بۆت هاتووە ؟ (مەریەم)یش ووتی لە لایەن خواوە ، خوا ویستی لە هەر كەسێك بێت ڕزق و ڕۆزیی دەدات بە بێ ژماردن .

قال البيضاوي : (﴿وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى﴾ أي : وليس الذكر الـــذي طلبتِ كالأنثى التـــي وهبتُ ، لعلَّ الأنثى كانت خيراً) .

واتە : ئەو كوڕەی كە تۆ داوات كردووە وەكو ئەو كچە نییە كە من بەخشیومە ، لەوانەیە كچ چاك تربێت .

لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەم كچە بەڕێزە چەند گەورە و پایە دار بووە لای خوای پەروەردگار و چۆن خوای گەورە ڕێزی لێ گرتووە و كەرامەتی ئەوەی پێداوە كە ڕزق و ڕۆزیی بۆ ناردووە بە بێ هۆكارێكی بەر چاویی و بەڵكو دواتر كە پێغەمبەر (عیسی)ی دەبێت (عليه السلام) خوای پەروەردگار (وەحی) بۆ دەنێرێت و چەندین شتی تریش ـــ كە لێرەدا دەرفەتی باسكردنیانمان نییە ــ .

وە هەر لەم بارەیەوە دەقێكی ئەدەبی بەرز و جوان هاتووە كە باس لە ڕێز و پلەوپایەی ئافرەت دەكات :

لە سەردەمی (أبـــو منـــصور الثعالبـــــي)دا پیـاوێكی نـاودار و بـەناوبانگی ئـەو سـەردەمە كاتێـك خـوای گـەورە كـچێكی پـێ دەبەخشێت (أبو منصور) نامەیەكی بۆ دەنێرێت كە تێیدا دەڵێت :

ولـــو كان النساءُ كمثلِ هذي    لَفُضِّلَتِ النساءُ علـــى الرِّجالِ

فما التأنيثُ لاسمِ الشَّمسِ عَيْبٌ    ولا الـــتذيرُ فَخْرٌ للـــهلالِ

واتە :

ئەگەر ئافرەتان وەكو ئەمە ببوایەن

ئەوا ئافرەتان بە باشتر دادەنران لە پیاوان

جا نەمێینەیەتی عەیب و نەنگییە بۆ خۆر

نە نێرینەیەتیش شانازییە بۆ مانگ *

---

* ئەم بەسەرهاتەم لە كتێبی (صناعة الـــرُّوّاد) لە دانانی (مَـــريم عبـــد الله النعيمي)ەوە وەرگرتووە لە ژێر ناونیشانی : ( **مَـبروك رُزقْـتَ بـأُنثى** ) واتـە : (پیرۆزت بێت كە خوا كچێكی پێبەخشیت) ، لاپەڕە : (٦٠) .

**تێبینی** : مەسەلەی (تأنيث الشمس / مێینەیەتی خـۆر) و (تذكير القمـــر أو الـــــهلال / نێرینەیـەتی مـانگ ) لـە زمـانی عەرەبیـدا بابـەتێكی ناسـراوە و شاراوە نییە .

وە ئیمامی (الشوكانـــي) فەرموویـەتی : (لَـــمْ يُنقل عن أحدٍ من العُلماء أنَّــهُ رَدَّ خبرَ امرأةٍ لكونـــها امرأة ، فكَمْ من سُنَّةٍ قـــد تلقتها الأمَّـــةُ بالقبول من امرأةٍ واحدة من الصحابة ، وهذا لا ينكرهُ مَنْ لـــهُ أدنَى نصيب من عِلم السُّـــنَّـــة)*

واتــە : لــە هـیچ زانایەكـەوە ئـەوە نەگوێزراوەتــەوە كـەوا فـەرموودەی ئـافرەتێكی ڕەت كردبێتـەوە تـەنها لـە بـەر ئـەوەی ئافرەتە ، چەندین فـەرموودە هەیە كەوا هەموو ئوممـەتی ئیـسلام وەریانگرتووە كە لە تەنها ئافرەتێكەوە لە ئافرەتانی صـەحابەوە ریوایەت كراوە ، وە ئەمەش كەسێك نـیە تكۆڵی لـێبكات ئەگـەر تۆزێك زانیاری هەبێت لە زانستی فەرموودەدا .

---

مەبەستی (أبو منصور الثـــعالبـــي) و (مَريـــم عبد الله) و (وەرگێڕیش : محمد عبد الرحمن) لێرەدا ئەوەیە كە خوودی (مێینەیەتی) یان (نێرینەیەتی) نابێتــە جـێی عەیبـە و نـەنگی یان شـانازی ، چونكە ئەوەتـە (خـۆر) لـە زمانەوانیدا (مێیە) و كە چی ئەمەش عەیبە و نەنگی نـیـە بـۆی ، هـەروەها (مانگ) لە زمانەوانیدا (نێرە) و كە چی ئەمەش شانازی نـیە بۆی .

* ئەم وتەیەم لە هەمان كتێبەوە وەرگرتووە ل : (٥٩) .

## * فەزڵ و گەورەیی پاداشتی بەخێوكردنی كچان :

چەندین فەرموودەی زۆر و ڕوون و ئاشكرا هاتووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) كە باس لە گەورەیی و فەزڵ و چاكەی بە خێوكردنی كچان و خوشكان دەكات و هەموویان پاڵنەر و هاندەرن بۆ گرنگی دان بە (كچان و خوشكان) لە ڕووی بە خێوكردن و سەرپەرشتی كردن و سۆز و بەزەیی دەربڕین و خۆپاریزی كردن و لە خوا ترسان و چاكە كردن لە ئاستیاندا :

زانای بەناوبانگ و شێخی ئیسلام و پێشەوای ئەهلی سوننە لەم سەردەمدا (ئیمامی ئەلبانی) لە كتێبی : (سلسلة الأحاديث الصحيحة / زنجیرەی فەرموودە صەحیحەكان)دا فەرموویەتی :

**(باب فضلُ تربيةِ البنات)**

**(بابەتی گەورەیی و فەزڵی بە خێوكردنی كچان)**

ئەنجا (ئیمامی ئەلبانی) لە كتێبی ناوبراودا و هەروەها لە چەندین كتێبی تردا ئەم فەرموودانەی خوارەوەی باس كردووە لەم بابەتەدا :

عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (ﷺ) قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ :

((مَنْ كَانَ لَهُ ثَلاَثُ بَنَاتٍ ، فَصَبَرَ عَلَيْهِنَّ وَأَطْعَمَهُنَّ وَسَقَاهُنَّ وَكَسَاهُنَّ مِنْ جِدَتِهِ كُنَّ لَهُ حِجَاباً مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ))[٨].

واته : هەر كەسێك سێ كچی هەبێت ، وە ئارامیان لە سەر بگرێت و خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگیان بۆ دابین بكات بە هەوڵ و توانای خۆی : ئەوا ئەو سێ كچە دەبنە بەربەستێك بۆی و دەیپارێزن لە ئاگری دۆزەخ لە ڕۆژی قیامەتدا .

وقال الإمام الألباني عقب هذا الحديث : (ولفظ أحمد :

((لاَ يَكُونُ لأَحَدٍ ثَلاَثُ بَنَاتٍ أَوْ ثَلاَثُ أَخَوَاتٍ أَوِ ابْنَتَانِ أَوْ أُخْتَانِ فَيَتَّقِي اللَّهَ فِيهِنَّ وَيُحْسِنُ إِلَيْهِنَّ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ))[٩].

واته : هیچ كەسێك نییە سێ كچی هەبێت یان سێ خوشكی هەبێت یان دوو كچی هەبێت یان دوو خوشكی هەبێت و لە ئاستیاندا لە خوا بترسێت و چاكەیان لە گەڵ بكات ئیللا دەچێتە بەهەشتەوە .

وعن جابر بن عبد الله (ﷺ) قال: قَالَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) : ((مَنْ عَالَ ثَلاَثاً مِنْ بَنَاتٍ ، يَكْفِيهِنَّ وَيَرْحَمُهُنَّ وَيَرْفُقُ بِهِنَّ ، فَهُوَ فِي الْجَنَّةِ))[١٠].

---

[٨] صحيح الجامع الصغير رقم : (٦٤٨٨) وصحيح سنن ابن ماجه رقم : (٣٦٦٩) وصحيح الأدب المفرد رقم : (٧٦) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٩٤) .

[٩] سلسلة الأحاديث الصحيحة : (١/ ٥٩٠ ـ ٥٩١) وصحيح الأدب المفرد رقم : (٧٩).

واتــە : هــەر كەســێك ســێ كــچ بــە خێــو بكــات و ئەوەنــدە پێداویستییەكانیان بۆ دابین بكات كەوا بەسیان بێت و بە بەزیی بێت بەرامبەریان و نەرم و نیان بێت لە گەڵیانا ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە .

وعَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ : قَالَ رَسُوْلُ اللَّهِ (ﷺ) : ((لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِي يَعُوْلُ ثَلاثَ بَنَاتٍ أَوْ ثَلاثَ أَخَوَاتٍ فَيُحْسِنُ إِلَيْهِنَّ إِلاَّ كُنَّ لَهُ سِتْرًا مِنَ النَّارِ))[11].

واتە : هیچ كەسێك نییە لە ئوممەتەكەم سێ كچ یان سێ خوشك بە خێو بكات و چاكەكاریان لە گەڵ بكات ئیللا دەبنە بەربەستێك بۆی و دەیپارێزن لە ئاگری دۆزەخ .

وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ : أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : ((لاَ يَكُونُ لأَحَدٍ ثَلاَثُ بَنَاتٍ أَوْ ثَلاَثُ أَخَوَاتٍ فَيُحْسِنُ إِلَيْهِنَّ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ))[12].

---

(10) سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٤٩٢) .

* قال ابن الأثير : (يُقال : عالَ الرجل عياله يعولهم إذا قام بما يحتاجون إليه من قُوت وكسوة وغيرهما ...) النهاية في غريب الحديث : ( (٣ / ٣٢١) .

(11) صحيح الجامع الصغير رقم : (٥٣٧٢) .

(12) صحيح الأدب المفرد رقم : (٧٩) .

واته : هیچ كه‌سێك نی‌یه سێ كچی هه‌بێت یان سێ خوشكی هه‌بێت و چاكه‌كاریان له گه‌ڵا بكات ئیللا ده‌چێته به‌هه‌شته‌وه .

وَعَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((مَنْ كَانَ لَهُ ثَلاَثُ بَنَاتٍ يُؤْوِيهِنَّ وَيَرْحَمُهُنَّ وَيَكْفُلُهُنَّ [وَيُزَوِّجُهُنَّ][١٣] فَقَدْ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ الْبَتَّةَ ، قِيلَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ ؟ قَالَ : وَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ ، قَالَ : فَرَأَى بَعْضُ الْقَوْمِ أَنْ لَوْ قَالَ : وَاحِدَةً ؟ لَقَالَ : وَاحِدَةً))[١٤] .

واته : هه‌ر كه‌سێك سێ كچی هه‌بێت و بیانگرێته خۆی و به خێویان بكات و به به‌زیی بێت به‌رامبه‌ریان و كه‌فاله‌تی دابین كردنی پێداویستی‌یه‌كانیان بۆ بكات و سه‌رپه‌رشتیان بكات و بیاندات به شوو ئه‌وا به‌هه‌شتی مسۆگر كردووه به هاتاهه‌تایی ، ووترا : ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ئه‌گه‌ر دوو كچیش بێت ؟ فه‌رمووی :

---

[١٣] قال الإمامُ المنذري في تخريج هذا الحديث : (رواه أحمد بإسناد جيد والبزار والطبراني في "الأوسط" وزاد : "ويزوجهن" ) ، قلت : أقر الشيخ الألباني قول المنذري هذا ونقلهُ في " الصحيحة" مقراً لهُ أيضاً فقال : (والحديث أوردهُ المنذري في "الترغيب" : (٣ / ٨٤ ـــ ٨٥) ، وقال : ((رواه أحمد بإسناد جيد والبزار والطبراني في "الأوسط" وزاد : "ويزوجهن")) ) سلسلة الأحاديث الصحيحة : (٣ / ٢٤ ـــ ٢٥) الحديث رقم : (١٠٢٧) .

[١٤] صحيح الترغيب والترهيب رقم : (١٩٧٥) وصحيح الأدب المفرد رقم : (٧٨) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (١٠٢٧) و رقم : (٢٦٧٩) .

ئەگەر دوو كچیش بێت ، ووتی : هەندێك لە خەڵكەكە گومانیان وابوو ئەگەر بیووتایەت یەك كچیش ئەوا دەیفەروو : یەكێكیش .

وَعَنْ أَبِي سَعِيد الْـخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) : ((مَنْ كَانَ لَهُ ثَلاَثُ بَنَاتٍ أَوْ ثَلاَثُ أَخوَاتٍ أَوِ ابْنَتَانِ أَوْ أُختَانِ فَأَحْسَنَ صُحْبَتَهُنَّ وَاتَّقَى اللَّهَ فِيهِنَّ فَلَهُ الْجَنَّةُ))[١٥] .

واتە : هیچ كەسێك نی‌یە سێ كچی هەبێت یان سێ خوشكی هەبێت یان دوو كچی هەبێت یان دوو خوشكی هەبێت و بە چاكی هاوەڵێتیان بكات و لە ئاستیاندا لە خوا بترسێت ئەوا بەهەشت بۆ ئەوە .

وفي رواية : ((فَأَدَّبَهُنَّ وَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ وَزَوَّجَهُنَّ ، فَلَهُ الْجَنَّةُ))[١٦] .

واتە : پەروەردەیان بكات و چاكەیان لە گەڵا بكات و بیاندات بە شوو ئەوا بەهەشت بۆ ئەوە .

وَعَنْ عَوْف بن مَالك (ﷺ) أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ : ((مَا مِـنْ مُسْلِمٍ يَكُونُ لَهُ ثَلاثُ بنات فَيُنْفِقُ عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَبِنَّ أَوْ يَمُتْنَ إِلاَّ كُنَّ لَهُ حِجَابًا مِنَ النَّارِ ، فَقَالَتِ لَهُ امْرَأَةٌ : أَوِ ابْنَتَانِ ؟ قَالَ : أَوْ ابْنَتَانِ))[١٧] .

---

[١٥] صحيح الترغيب والترهيب رقم : (١٩٧٣) .

[١٦] صحيح لغيره قالهُ الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" رقم : (١٩٧٣) .

[١٧] صحيح الترغيب والترهيب رقم : (١٩٧٢) .

واته : هیچ موسڵمانێك نی‌یه سێ كچی هەبێت و نەفەقەیان بۆ بدات و بەخێویان بكات تاوەكو شوو دەكەن یان تاوەكو دەمرن ئیللا دەبنە بەربەستێك بۆی و دەیپارێزن له ئاگری دۆزەخ ، ئافرەتێك ووتی : ئەگەر دوو كچیش بێت ؟ فەرمووی : ئەگەر دوو كچیش بێت .

وقال ابن الأثير في "النهاية" في (مادة بَيَنَ) : ("من عال ثلاث بنات حتَّى يَبِنَّ أَوْ يَمُتْنَ " ، يَبِنَّ : بفتح الياء أي يتَزَوَّجْنَ ، يُقال : أبان فلانٌ بنْتَه وبيَّنَها إذا زوَّجها ، وبانتْ هي إذا تزوجت ، وكأنه من البَيْنِ : البعد أي بَعُدَتْ عن بيت أبيها ، ومنه الحديث الآخر : "حتى بانوا أو ماتوا")[١٨].

به كورتی واته : ووشەی : (يَبِنَّ) مانای ئەوەیه : شوو بكات ، چونكه له بنەوادا ووشەی : (يَبِنَّ) له ووشەی (البين)ەوە وەرگیراوه ، ووشەی (البين)ش بەرامبەرەكەی :

---

[١٨] النهاية في غريب الحديث : (١ / ١٧٥) ، وقال ابن منظور في "لسان العرب" : (يقال للجارية إذا تزوجت قد بانت وهُنَّ قد بِن إذا تزوجنَ ، وبَيّنَ فلانٌ بنته وأبانها إذا زوَّجها وصارت إلى زوجها ، وبانتْ هي إذا تزوجت ، وكأنه من البئر البعيدة أي بعدت عن بيت أبيها ، وفي الحديث : "من عال ثلاث بنات حتى يبن أو يمتن" يَبِنَّ بفتح الياء أي يتزوجن ، وفي الحديث الآخر : "حتى بانوا أو ماتوا") (١٣ / ٦٤) .

(البعد)ـە واتا دووری ، چونكە كچ بە شـووكردنی لـە مـاڵی بـاوكی دوور دەكەوێتەوە .

وقال صحاب العون الـمعبود : ("حَتَّى بَانُوا" أَيْ إِلَى أَنْ كَبِرُوا وَحَصَلَتْ لَهُمْ الْإِبَانَة أَوْ وَصَلُوا إِلَى مَرْتَبَة كَمَالهمْ ...

واتە : بەخێویان بكات تاوەكو گەورە دەبن و دەگەنـە ئاسـتێك شتیان لە لا ڕوون بێت یان تاوەكو پێ دەگەن و دەگەنـە ئاسـتی كامڵ بوون ...

وَقَالَ الشَارِحُ : أَيْ حَتَّى فَضَلُوا وَزَادُوا قُوَّةً وَعَقْـلاً وَاسْـتَقَلُّوا بِأَمْرِهِمْ ، مِنْ الْبَوْنِ وَهُوَ الْفَضْلُ وَالْمَزِيَّةُ كَذَا قَالَ الْقَارِي ؛ وَقَالَ فِـي "النِّهَايَة" [ثُمَّ نقل قول ابن الأثير] ، انْتَهَى)[١٩].

واتە : تاوەكو چاك پێ‌دەگەن و هێز و توانـا و عـەقڵ و ژیریـان گەشـە و زیـاد دەكـات و بتـوانن سـەربەخۆ بـن لـە ئـیش و كـاری خۆیاندا ، چونكە ووشەی (بَيَنَ) لە ووشەی (البون)ەوە وەرگیراوە كە بریتییە لە چاكێتی و هەڵكەتوویەتی ...

كورتەی مەبەسـت لـەم فەرموودەیـەدا ئەوەیـە : ئەگـەر كـچان بەخێوبكرێن تاوەكو گەورە دەبن و دەگەنە ئاستێك شـتیان لـە لا

---

[١٩] عون الـمعبود شرح سنن أبـي داود : (١٤ / ٤١) .

ڕوون بێت یان تاوەکو پێ دەگەن و دەگەنە ئاستی کامڵ بوون ... یان تاوەکو چاك پێدەگەن و هێز و توانا و عەقڵ و ژیریان گەشە و زیاد دەکات و بتوانن سەربەخۆ بن لە ئیش و کاری خۆیاندا و ئەنجا بدرێن بە شوو ، یان بەخێوبکرێن تاوەکو دەمرن ئەوا دەبنە بەربەست و پارێزەر لە ئاگری دۆزەخ .

وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِك (ﷺ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) : «مَـنْ كُنَّ لَهُ ثَلاَثُ بَنَات أَوْ ثَلاَثُ أَخَوَات فَاتَّقَى اللَّهَ ، وَأَقَامَ عَلَيْهِنَّ ، كَانَ مَعِي فِي الْجَنَّةِ هَكَذَا ، وَأَوْمَأَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى»[٢٠].

واتە : هەر کەسێك سێ کچی هەبێت یان سێ خوشکی هەبێت و لە خوا بترسێت لە ئاستیاندا و خۆپارێزی بکات لە ستەم لێکردنیان و سەرپەرشتیان بکات و بەخێویان بکات ئەوا ئەو کەسە لە گەڵ مندایە لە بەهەشتدا وەکو ئەمە و ئاماژەی کرد بۆ پەنجەی شایەتومان و پەنجی ناوەڕاستی .

وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِك (ﷺ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) : «مَـنْ عَالَ ابْنَتَيْنِ أَوْ ثَلاَثَ بَنَات أَوْ أُخْتَيْنِ أَوْ ثَلاَثَ أَخَوَات حَتَّـى يَمُـتْنَ [وفـي رواية : يَبِنَّ ، وفـي أخرى : يَـبْلُغْنَ] أَوْ يَمُوتَ عَنْهُنَّ كُنْتُ

---

[٢٠] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٩٥) .

أَنَا وَهُوَ كَهَاتَيْنِ ، وَأَشَارَ بِأُصْبُعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى)) [21].

واته : هەر كەسێك دوو كچ یان سێ كچ یان دوو خوشك یان سێ خوشكی بەخێو بكات تاوەكو دەمرن ﴿لە ریوایەتێكی تردا : تاوەكو شوو دەكەن ، وە لە یەكێكی تردا : تاوەكو پێدەگەن و باڵغ دەبن﴾ یان تاوەكو ئەو كەسە خۆی دەمرێت و بە جیاندەهێڵێت ، ئەوا من و ئەو لە بەهەشتدا پێكەوە ئاوەهاین و ئاماژەی كرد بۆ پەنجەی شایەتومان و پەنجی ناوەڕاستی .

هەروەها زانی بەناوبانگ و پێشەوا و فەرموودەناسی ئەهلی سوننە (ئیمامی مُسلِم) لە كتێبی (صحيح مسلم)دا فەرموویەتی :

**(باب فضل الإحسان إلى البنات)**

**(فەزڵ و گەورەیی چاكەكاری لە گەڵ كچاندا)**

وَعَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَتْ : ((جَاءَتْنِي امْرَأَةٌ وَمَعَهَا ابْنَتَانِ لَهَا فَسَأَلَتْنِي فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي شَيْئًا غَيْرَ تَمْرَةٍ وَاحِدَةٍ ، فَأَعْطَيْتُهَا إِيَّاهَا ، فَأَخَذَتْهَا فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا وَلَمْ تَأْكُلْ مِنْهَا شَيْئًا ، ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ وَابْنَتَاهَا ، فَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ (ﷺ) فَحَدَّثْتُهُ حَدِيثَهَا ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) : مَنِ ابْتُلِيَ مِنَ الْبَنَاتِ بِشَيْءٍ فَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ كُنَّ لَهُ سِتْرًا

---

[21] سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٩٦) .

مِنَ النَّارِ))[٢٢].

واته : عائیشه‌ی خێزانی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمووی : ئافره‌تێك هات بۆلام و دوو کچی خۆیشی له گه‌ڵا بوو ، ئه‌نجا داوای لێم کرد و هیچی له لام ده‌ست نه‌که‌وت جگه له یه‌ك ده‌نکه خورما نه‌بێت ، منیش ئه‌و ده‌نکه خورمایه‌م پێدا و ئه‌ویش وه‌ریگرت و ئه‌نجا به‌شی کرد له نێوان هه‌ردووکیاندا ، و خۆی هیچ شتێکی لێ نه‌خوارد ، پاشان هه‌ستا و خۆی و دوو کچه‌که‌ی ده‌رچوون و ڕۆیشتن ، ئه‌نجا پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) هاته ژووره‌وه بۆ لام و منیش باسی ئه‌و ئافره‌ته‌م بۆ گێڕایه‌وه ، ئه‌نجا له به‌ر ئه‌مه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمووی : هه‌ر که‌سێك تاقیکرایه‌وه به شتێك له کچان و چاکه‌کار بوو له گه‌ڵیانا ئه‌وا ده‌بنه به‌ربه‌ست و پارێزه‌ر بووی له ئاگر .

قال الإمام النووي : (قوله ﷺ : "مَنِ ابْتُلِيَ مِنَ الْبَنَاتِ بِشَيْءٍ" إِنَّمَا سَمَّاهُ ابْتِلَاءً لِأَنَّ النَّاس يَكْرَهُونَهُنَّ فِي الْعَادَة ، وَقَالَ اللَّه تَعَالَى : ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ﴾)[٢٣].

---

[٢٢] صحيح مسلم رقم : (٢٦٢٩) .

[٢٣] شرح صحيح مسلم : (٨ / ٢٢٨) .

واتــه : مەبەســت بــه فەرموودەكــەی پێغەمبــەر (ﷺ) : "هــەر كەسـێك تاقیكرایـەوە بـه شـتێك لـه كـچان" لـه بـەر ئـەوە بـه تاقیكردنـەوە نـاوی بـردووە چـونكە داب و نـەرێتی ـــ نـەفامی و جاهلیەتی ـــ خـەڵك وایـه حـەزیان لـه كـچ نیـیـه و كـچیان پــێ ناخۆشه ، خوای پایه بەرز فەرموویەتی : ئەگەر موژدەی له دایـك بوونی كچ بدرییایەت بـه یـەكێك لـه بێباوەڕەكـان ئـەوا ڕوومـەتی ڕەش هەڵدەگەڕا له غەمباری و شەرمەزاریدا و ڕق و قـینی خـۆیی بەرامبەر به ژنكەیی دەخواردەوە .

وَعَنْ عَائشَةَ (رضي الله عنها) أَنَّـــهَا قَالَتْ : ((جَاءَتْني مسْكينَةٌ تَحْمـــلُ ابْنَتَيْنِ لَهَا ، فَأَطْعَمْتُهَا ثَلاَثَ تَمَرَات ، فَأَعْطَتْ كُلَّ وَاحدَة منْهُمَا تَمْرَةً ، وَرَفَعَتْ إِلَى فيهَا تَمْرَةً لتَأْكُلَهَا ، فَاسْتَطْعَمَتْهَا ابْنَتَاهَا ، فَشَقَّت التَّمْرَةَ الَّتي كَانَتْ تُرِيدُ أَنْ تَأْكُلَهَا بَيْنَهُمَا ، فَأَعْجَبَني شَأْنُهَا ، فَذَكَرْتُ الَّذي صَنَعَتْ لرَسُولِ اللّه (ﷺ) فَقَالَ : إِنَّ اللّهَ قَدْ أَوْجَبَ لَهَا بهَا الْجَنَّـــةَ أَوْ أَعْتَقَهَا بهَا منَ النَّارِ))[٢٤] .

واته : عائیشه فەرمووی : ئافرەتێكی هـەژار هـات بـۆلام و دوو كچی هەڵگرتبوو ، منیش سێ دەنكه خورمام پـێدا ، ئەویش هـەر

---

[٢٤] صحيح مسلم رقم : (٢٦٣٠) .

كچێك و ده‌نكه خورمایه‌كی پێدا ، و ده‌نكه خورماكه‌ی تری به‌رز كرده‌وه بۆ ده‌می بۆ ئه‌وه‌ی بیخوات ، جا دوو كچه‌كه‌ی داوای ئه‌و خورمایه‌شیان كرد ، ئه‌ویش ئه‌و خورمایه‌ی كه خۆی ویستی بیخوات له‌ت كرد و به‌شی كرد له نێوانیاندا ، منیش سه‌رم سوڕما له‌م هه‌ڵوێسته‌ی ، و ئه‌نجا ئه‌و كاره‌ی ئه‌و ئافره‌ته‌م باس كرد بۆ پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ئه‌ویش فه‌رمووی : خوای په‌روه‌ردگار به‌و كاره‌ی به‌هه‌شتی بۆ مسۆگر كرد یان فه‌رمووی : خوای په‌روه‌ردگار به‌و كاره‌ی ڕزگار و ئازادی كرد له ئاگر .

وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تُدْرِكَا ، دَخَلْتُ الْجَنَّةَ أَنَا وَهُوَ كَهَاتَيْنِ وَأَشَارَ بِأُصْبُعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى))[٢٥].

وفي رواية : ((مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا ، دَخَلْتُ أَنَا وَهُوَ الْجَنَّةَ كَهَاتَيْنِ وَأَشَارَ بِأُصْبُعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالَّتِي تَلِيهَا))[٢٦].

واته : هه‌ر كه‌سێك دوو كچ به‌خێو بكات تاوه‌كو پێده‌گه‌ن و باڵغ ده‌بن ئه‌وا من و ئه‌و پێكه‌وه ده‌چینه به‌هه‌شته‌وه وه‌كو ئه‌مه

---

[٢٥] صحيح الجامع الصغير رقم : (٣٦٩١) وصحيح الأدب المفرد رقم : (٨٩٤) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (١١٢٠) .

[٢٦] صحيح مسلم رقم : (٢٦٣١) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٩٧) .

، و ئاماژەی كرد بۆ پەنجەی شایەتومان و پەنجەی ناوەڕاستی .

قال الإمام النووي : (فِي هَذه الْأَحَاديث فَضْلُ الْإحْسَان إلَى الْبَنَات ، وَالنَّفَقَة عَلَيْهِنَّ ، وَالصَّبْرِ عَلَيْهِنَّ ، وَعَلَى سَائر أُمُورهنَّ)[٢٧].

واتە : ئەم فەرموودانە بەڵگەن بۆ : فەزڵ و گەورەیی چاكەكاری لە گەڵ كچان و نەفەقە كردنیان و ئارامگرتن بەرامبەریان لە سەر هەموو پێداویستی و ئیش و كارەكانیان .

**ئا ئەمەیە هەڵویستی ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) بەرامبەر بە كچان و خوشكان .**

بەڵام ئەوانەی كە بانگەشەی (مافی ئافرەت) دەكەن تاوەكو ئێستا نەیانتوانیوە تەنها دانەیەك لەم مافانەش بۆ كچان و خوشكان دابین بكەن !

بەڵكو ئەوان دەیانەوێت كچان و خوشكان ببن بە ئامێر و كەرەستەی پارە و پووڵ پەیدا كردن بۆ خۆڕازاندەوەی خۆیان بە مەبەست لە دەست دانی كەسایەتی و شەرەف و ناموسی ئافرەتان و لە هەمان كاتیشدا سەرلێشێوان و ڕووخانی توانا و ویستی كوڕان بە هۆی ئەوانەوە !!!

---

[٢٧] شرح صحيح مسلم : (٨ / ٢٢٨) .

## * سەرهەڵدانەوەی كوشتنی كچان بە شێوازێكی نوێ :

دوای زانینی هەڵوێستی خەڵكانی سەردەمی جاهیلیەتی پێش ئیسلام و خەڵكانی ئەم سەردەمش بەرامبەر بە لە دایك بوونی كچان و دوای زانینی شێوازی كوشتنی كچان لە سەردەمی جاهلیەتی پێش ئیسلام كە زیندەبەچاڵكردن بوو :

دوای ئەمانە با بزانین شێوازە نوێكانی **كوشتنی كچان** لەم سەردەمدا چۆنن ؟؟؟

*** كوشتنی كچان لەم سەردەمەدا دوو جۆرن :**

**یەكەم : كوشتنێكی ڕاستەوخۆ :**

ئەمە جۆرەش بە دوو نموونە ڕوون دەكەینەوە :

١ ـ لە وڵاتی (چین / صین) كە یەكێكە لە وڵاتە پێشكەوتووەكانی جیهان لە ڕووی (تەكنەلۆجیاوە) ئەگەر خێزانێك منداڵی كچیان ببێت ئەوا ڕاستەوخۆ دەیكوژن چونكە لای ئەوان سنوور دانراوە بۆ ڕێژەی منداڵ بوون لە بەر ئەمە ئەوان كچان دەكوژن چونكە كچ توانای كاری جەستەیی نییە و لە توانایدا نییە پارە و پوول بۆ باوك و دایكی دڵی ڕەق و

كافریان بێنێتەوە !!

٢ ـ لە بار بردنی منداڵی كچ [بە جۆرێك دەرزی و حەپی تایبەت] دوای ئەوەی كە بە تیشكی سۆنار دەركەووت بۆیان منداڵەكەیان كچە .

ئەم شێوازەش لە وولاتی خۆماندا هەیە و هەروەها لە هەموو وولاتانی جیهانیشدا !!!

**دووەم : كوشتنێكی نا ڕاستەوخۆ :**

ئەم جۆرەش دەبێت بە دوو بەشەوە :

١ ـ ڕێگرتن لە پەیدا بوونی كچان :

ئەمەش لەوەدا بە دی دەكرێت كاتێك دەبینین زۆربەی ئەو خێزانانەی كەوا چەند كچێكیان لە سەر یەك تێدا پەیدا دەبێ یان ڕێژەی كچان لە ناو خێزانەكدا زیاتر دەبێ لە ڕێژەی كوڕان دەبینین ئەو خێزانە پەنا دەبەنە بەر سنوور دانان و گرتنەوەی منداڵ بوون بە مەبەستی ئەوەی ڕێژە و ژمارەی كچ زاڵ نەبێت بە سەر خێزانەكەدا بۆ ئەم مەبەستەش چەند ڕێگایەك دەگرنە بەر ، لەوانە :

ـ منالّدان بەستن بە دانانی (لەولەب) .

ـ خواردنی حەپی بەرگیری کردن لە منداڵ بوون ، یان کوتـانی (دەرزی) تایبەت بەو مەبەستە ... هتد[(٢٨)] .

٢ ـ کوشتنی کچان دوای پێگەیشتنیان :

ئەمەش لەوەدا بە دی دەکرێت کاتێك دەبینین :

---

(٢٨) لێرەدا ووتەیەکی ئیمامی (ابن العثيمين) ڕەحمەتی خوای لێبێت باس دەکەین بۆ ئەو ئافرەتانەی کەوا (حەپی مەنع) بەکاردێنن ، پێشەوا فەرموویەتی : (إنَّ استعمال هذه الحبوب ضار على المرأة ، على رحمها، وعلى عادتها ، وعلى دمها ، بل وعلى جنينها في المستقبل ، وقد يحصل من هذه الحبوب تشويه للأجنة فيخرج الجنين مشوهاً ، ولهذا كثر الآن التشويه ، ما أكثر ما نُسأل عن جنين في بطن أمه ليس على رأسه عظم ، ونُسأل عن جنين مشوه ، كل هذا من أجل هذه الحبوب التي ضرت المسلمين من جهة ، ومنعت كثرة الإنجاب من جهة أخرى) [مجموع فتاوى الشيخ ابن العثيمين : المجلد السابع عشر / الفتوى رقم : (٧٢٢)].

واتە : بەکارهێنانی ئەم حەپانە زەرەر و زیانی هەیە بۆ ئافرەتان ، زەرەری هەیە بۆ منداڵدانی ، بۆ عادەکەی ، بۆ سەر خوێنەکەی ، بەڵکو بۆ کورپەڵەکەی لە داهاتوودا ، وە هەندێك جار بە هۆی ئەم حەپەوە ناتەواوی و تێکچوون دێت بە سەر کورپەڵەکەدا و بۆیە کورپەڵەیەکی ناتەواو دەردەچێت ، لە بەر ئەمە ئێستا تێکچوونی منداڵ زۆر بووە ، وە زۆر جارێك پرسیارمان لێدەکرێت سەبارەت بە کورپەڵەیەك کە لە سکی دایکیدایە و سەری ئێسکی تێدا نییە ، وە پرسیارمان لێدەکرێت سەبارەت بە کورپەڵەیەکی تێکچوو و ناتەواو ، هەموو ئەمانە هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم حەپانە کەوا زیانی گەیاند بە موسڵمانان لە ڕوویەکەوە ، وە بەرگیری کرد لە زۆر بوونی منداڵ بوون لە ڕوویەکی ترەوە .

أ / ئافرەت دەکرێت بە ئامێری ئیش و کار و پارە و پوول پەیدا کردن ئەگەر چی لە ڕۆژێکیشدا (١٢) کاتژمێر کار بکات لە گارگەکاندا وەك لە وولاتانی ڕۆژئاوا و ئەورۆپادا ئەمە هەیە !!!

ئەمە خۆی لە خۆیدا شێوازێکە لە شێوازەکانی کوشتنی کچان ، چونکە باری دەروونی و فیسۆلۆجی ئافرەتان لە بار نیە بۆ کاری جەستەیی کردن بەو ئەندازەیەی کە (بانگەشەکارانی مافی ئافرەت) لێرە و لەوێ بانگەشەی بۆ دەکەن !

بۆیە دەبینین هەندێك جار هەندێك لەو ئافرەتانە بە مەبەستی ڕزگار بوون و خۆ قوتار کردن لەو مەینەتی و ئەشکەنجانە پەنا دەبەنە بەر خۆ کوشتن و (ئینتیحار کردن).

ب / هەروەها بە شوو نەدانی کچان بە پێی ویست و بڕیاری خۆیان شێوازێکە لە شێوازە ناڕاستەوخۆکانی کوشتنی کچان :

ئەمەش دەبێت بە دوو بەشەوە :

**١ـ بە شوو دانی زۆرەملێ :**

هەندێك جار هەندێك لە کچان بە زۆر و لە ژێر زەبری هەڕەشە و گوڕەشەدا مارە دەکرێن و دەدرێن بە کەسانێك کەوا ویستیان لە سەری نیە و پێی ڕازی نابن و نایانەوێت ئەو جۆرە

كەسانە ببن بە هاوسەر و هاوبەشی ژیانیان ، بەڵام كچەی بێدەسەڵات و داماو ناچار دەكەن كەوا هەر دەبێت ڕەزامەندی دەربڕێ و قایل ببێت بەو كەسەی كە ئەم لەوانەیە هەر حەز نەكات بیشی بینێت چ جای ببێت بە هاوسەر و هاوبەشی ژیانی !

بۆیە دەبینین ئەو جۆرە هاوسەری گرتنە دەبێتە مایەی ناسۆری و پڕ مەینەتی و كوێرەوەری و نەهامەتی و بەد بەختی و شەڕ و ئاژاوەی ڕۆژانە بۆ كچەی بە زۆر بە شوو دراوی هەست و نەست و حەز و ویست مردێنراو كەوا بەس تەنها بە جەستە لە دونیادا دەژی !!!

لە بەر ئەمە دەبینین هەندێك جار هەندێك لەو ئافرەتانە بە مەبەستی ڕزگار بوون و خۆ قوتار كردن لەو مەینەتی و ئەشكەنجە و ناڕەحەتی‌یانە پەنا دەبەنە بەر خۆ كوشتن و (**خۆسووتاندن** !!!!) .

وە لێرەدا جێی خۆیەتی كەوا بڵێین : لە شەریعەتی ئیسلامی پیرۆزدا كچان مافی هەڵبژاردن یان ڕەتكردنەوەی خوازبێنی‌كاریان هەیە ، وە ئەم ڕاستی‌یە ـ پشت گوێ خراوە ـ لەم فەرموودانەی پێغەمبەردا (ﷺ) بە دی دەكرێت :

لـە دووەمـین سەرچـاوەی شـەریعەتی ئیـسلامی پـیرۆزدا دوای قورئانی پیرۆز كە بریتییە لە كتێبی : (صحيح البخاري) پێشەوا و فەرمودەناس ئیمامی (البخاري) بابەت و ناونیشانێكی تایبەتی باسكردووە و فەرموویەتی : (بـــاب : لا يـــــجوز نكـــاح الـــمُكرَه)[٢٩].

**واتە : (نابێت و دروست نییە ئافرەت بە زۆر مارە بكرێت و بدرێت بە شوو) :**

ئەنجا سەبارەت بەم بابەتە و لە ژێر ئەم ناونیشانەدا دوو فەرموودەی باس كردووە كە بریتین لە :

عَنْ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِذَامٍ الأَنْصَارِيَّةِ قَالَتْ : ((أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَــا وَهْيَ ثَيِّبٌ ، فَكَرِهَتْ ذَلِكَ ، فَأَتَتْ النَّبِيَّ (ﷺ) فَرَدَّ نِكَاحَهَا))[٣٠].

واتە : ئەم ئافرەتە (خنساء بنت خذام) باوكی دای بە شوو لە كاتێكدا كە بێوەژن بوو ، ئەویش ئەمەی پێناخۆش بوو ، ئەنجا هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ، پێغەمبەریش (ﷺ) مارەكردنەكەی ڕەت كردەوە و هەڵیوەشاندەوە .

(٢٩) انظر : فتح الباري شرح صحيح البخاري : (١٢ / ٣٩٨) .

(٣٠) صحيح البخاري رقم : (٥١٣٨) و (٦٩٤٥) .

وَعَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ : «قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ يُسْتَأْمَرُ النِّسَاءُ فِي أَبْضَاعِهِنَّ : قَالَ : نَعَمْ ، قُلْتُ : فَإِنَّ الْبِكْرَ تُسْتَأْمَرُ فَتَسْتَحِي فَتَسْكُتُ ، قَالَ : سُكَاتُهَا إِذْنُهَا»[٣١].

واتە : عائیشە فەرمووی : ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئافرەتان پرس و ڕایان پێدەكرێت لە بە شوودانیاندا ؟ فەرمووی : بەڵێ ، ووتم : باشە ئەی كچە عازەو كاتێك پرس و ڕای پێدەكرێت شەرم دەكات بۆیە بێدەنگ دەبێت ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : بێدەنگ بوونی كچ نیشانە و بەڵگەی ڕازی بوونیەتی .

هەروەها ئیمامی (البخاري) بابەت و ناونیشانێكی تری تایبەتی باسكردووە و فەرموویەتی : (باب : لا يُنْكِحُ الأبُ وغيرُهُ البِكرَ والثَّيِّبَ إلاَّ برضاهما)[٣٢].

واتە : (نابێت و دروست نییە بۆ باوك و جگە لەویش كچ و بێوەژن مارەبكەن و بیاندەن بە شوو ئیللا بە ڕەزامەندی خۆیان نەبێت) :

ئەنجا دوو فەرموودەی باس كردووە ، كە یەكێكیان بریتییە

---

[٣١] صحيح البخاري رقم : (٥١٣٧) و (٦٩٤٨) .

[٣٢] انظر : فتح الباري شرح صحيح البخاري : (٩ / ٢٤٠) .

لە فەرموودەکەی (عائیشە)ی پێشوو ، فەرموودەی دووەمیش بریتییە لەم فەرموودەیە :

وعن أبـي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ : أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ : ((لاَ تُـنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ ، وَلاَ تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ ، قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ إِذْنُهَا ؟ قَالَ : أَنْ تَسْكُتَ))[٣٣].

واتە : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : نابێت بێوەژن بە شوو بدرێت و مارەیی نایەت تاوەکو خۆی بڕیار نەدات ، وە کچیش نابێت بە شوو بدرێت و مارەیی نایەت تاوەکو ئیزن و بۆچوونی وەرنەگیرێت ، ووترا : ئەی پێغەمبەری خوا ئیزن لێ وەرگرتنی کچ چۆنە ؟ فەرمووی : ئەوەیە کە بێدەنگ دەبێت .

واتە نیشانەی ڕەزامەندی کچ بەو خوازبێنیکارە ئەوەیە کە بێدەنگ ببێت ، چونکە لەو کاتەدا کچان شەرم دەکەن ڕای خۆیان بەڕاشکاوی دەربڕن ، وەك لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە :

وَعَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) أَنَّهَا قَالَتْ : يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْبِكْرَ تَسْتَحِي ، قَالَ : ((رِضَاهَا صَمْتُهَا))[٣٤].

---

[٣٣] صحيح البخاري رقم : (٥١٣٦) وصحيح مسلم رقم : (١٤١٩) .

واته : عائیشه فه‌رمووی : ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا كچه عازه‌و شه‌رم ده‌كات ڕا و هه‌ڵوێستی خۆی به ڕاشكاوی ده‌ربڕێت ، پێغه‌مبه‌ریش (ﷺ) فه‌رمووی : ڕه‌زامه‌ندی كچ به‌وه‌یه كه بێده‌نگ ببێت .

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ : «الأَيِّمُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا ، وَالْبِكْرُ تُسْتَأْذَنُ فِي نَفْسِهَا وَإِذْنُهَا صُمَاتُهَا»[٣٥].

واته : بێوه‌ژن له شووكردنیدا بڕیاری خۆی له پێش تره تاوه‌كو بڕیاری سه‌رپه‌رشتیاره‌كه‌ی ، وه كچه عازه‌ویش له شووكردنیدا ئیزن و ڕووخسه‌تی خۆیی لێوه‌رده‌گیرێت ، وه ئیزن و ڕێپێدانی كچه عازه‌ویش به‌وه‌یه كه بێده‌نگ ببێت .

قال الإمام الترمذي : (وَإِنَّمَا مَعْنَى قَوْلِ النَّبِيِّ (ﷺ) "الأَيِّمُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا" عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ : أَنَّ الْوَلِيَّ لاَ يُزَوِّجُهَا إِلاَّ بِرِضَاهَا وَأَمْرِهَا ، فَإِنْ زَوَّجَهَا فَالنِّكَاحُ مَفْسُوخٌ عَلَى حَدِيثِ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِذَامٍ حَيْثُ زَوَّجَهَا أَبُوهَا وَهِيَ ثَيِّبٌ فَكَرِهَتْ ذَلِكَ فَرَدَّ النَّبِيُّ (ﷺ) نِكَاحَهُ)[٣٦].

---

[٣٤] صحيح البخاري رقم : (٥١٣٧) .

[٣٥] صحيح مسلم رقم : (١٤٢١) وصحيح سنن الترمذي رقم : (١١٠٨) .

[٣٦] سنن الترمذي : (٣ / ٤١٦) وانظر : " تُحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي" : (٤ / ٢٥٣ ــ ٢٥٤) .

واتە : واتـای فەرموودەکـەی پێغەمبـەر (ﷺ) : "بێـوەژن لـە شـووکردنیدا بڕیـاری خـۆی لـە پـێش تـرە تـاوەکو بڕیـاری سەرپەرشـتیارەکەی" لای زوربـەی زانایـان ئەوەیـە کـە نابێـت سەرپەرشیارەکەی بیدات بە شوو ئیللا بـە ڕەزامەنـدی و بڕیـاری خۆی نەبێت ، وە ئەگەر دای بە شوو بـە بـێ ڕەزامـەنی و بڕیـاری خـۆی ئـەوا مارەکردنەکـەی هەڵوەشـراوە و دانەمـەزراوە لـە بـەر فەرموودەکـەی (خنساء بنت خذام) کـەوا بـاوکی دای بـە شـوو لـە کاتێکـدا کـە بێـوەژن بـوو ئـەویش ئەمـەی پێنـاخۆش بـوو ، پێغەمبـــــەریش (ﷺ) مارەکردنەکـــــەی ڕەت کـــــردەوە و هەڵیوەشاندەوە .

هـەروەها ئیمـامی (البخـــاري) بابـەت و ناونیـشانێکی تـری تایبەتی باسـکردووە و فەرموویـەتی : (باب : إذا زوَّجَ الرجلُ ابنتَهُ وهيَ كارهة فنكاحهُ مردود)[٣٧].

واتە : (ئەگەر پیاو کچەکەی دا بەشوو لە کاتێکدا کە کچەکەی ئەو شووکردنەی پێناخۆشە و پـێی ڕازی نـییە ئـەوا ئەو بە شوودانە ڕەت کراوەیە و دروست نییە) :

---

[٣٧] انظر : فتح الباري شرح صحيح البخاري : (٩ / ٢٤٣) .

ئەنجا فەرمووده‌کەی (خنساء بنت خذام الأنــصارية)ی پێشووی باس کردووە .

وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((الْيَتِيمَةُ تُسْتَأْمَرُ فِي نَفْسِهَا ، فَإِنْ صَمَتَتْ فَهُوَ إِذْنُهَا ، وَإِنْ أَبَتْ فَلاَ جَوَازَ عَلَيْهَا))[٣٨] .

واتە : کچی هەتیووی پێنەگیشتوو ئەگەر پێش پێگەیشتنی مارەکرا و درا بەشوو ئەوا دوای پێگەیشتن و بالغ بوونی پرس و ڕای پێدەکرێت ، جا ئەگەر بێدەنگ بوو ئەوا ئەوە نیشانەی ڕازی بوونی‌یەتی ، وە ئەگەر خۆی گرتەوە و ڕازی نەبوو ئەوا نابێت ستەم و زۆری لێبکرێت و بە زۆر بدرێت بە شوو .

وقال الإمام الترمذي أيضاً : (يَعْنِي : إِذَا أَدْرَكَتْ فَرَدَّتْ . . .

واتە : مەبەست ئەوەیە دوای پێگەیشتن و بالغ بوونی پرس و ڕای پێدەکرێت ، جا ئەگەر ڕەتی کردووە ، ئەوا نابێت ستەم و زۆری لێبکرێت و بە زۆر بدرێت بە شوو .

وَاخْتَلَفَ أَهْلُ الْعِلْمِ فِي تَزْوِيجِ الْيَتِيمَةِ : فَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنَّ الْيَتِيمَةَ إِذَا زُوِّجَتْ فَالنِّكَاحُ مَوْقُوفٌ حَتَّى تَبْلُغَ ، فَإِذَا بَلَغَتْ فَلَهَا الْخِيَارُ فِي إِجَازَةِ النِّكَاحِ أَوْ فَسْخِه ، وَهُوَ قَوْلُ بَعْضِ التَّابِعِينَ وَغَيْرِهِمْ .

---

[٣٨] صحيح سنن الترمذي رقم : (١١٠٩) .

وَقَالَ بَعْضُهُمْ : لاَ يَجُوزُ نِكَاحُ الْيَتِيمَةِ حَتَّى تَبْلُغَ ، وَلاَ يَجُوزُ الْخِيَارُ فِي النِّكَاحِ ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ وَالشَّافِعِيِّ وَغَيْرِهِمَا مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ ...)[٣٩].

واتە : جیاوازی هەیە لە نێوان زانایاندا سەبارەت بە مارە كردن و بە شوودانی كچی هەتیووی بچوك :

هەندێك لە زانایان بۆچوونیان وایە كەوا ئەگەر كچی هەتیووی بچوك مارە كرا ئەوا مارە كردنەكەی ڕادەوەستێنرێت تاوەكو باڵغ دەبێت و پێدەگات ، ئەنجا ئەگەر باڵغ بوو ئەو كاتە بە ویستی خۆی بواری هەڵبژاردنی بە ڕێكردن یان هەڵوەشاندنەوەی مارەكردنەكەی پێدەدرێت ، ئەمەش ووتەی هەندێك لە شوێنكەوتووان و جگە لەوانیشە .

وە هەندێكی تر لە زانایان فەرموویانە : نابێت و دروست نیيە كچی هەتیووی بچوك مارە بكرێت و بدرێت بە شوو تاوەكو باڵغ دەبێت و ئازاد بوون نییە لە هەڵبژاردنی بە ڕێكردن یان هەڵوەشاندنەوەی مارەكردن و بە شوودان دوای ئەوەی كە مارەبڕ كرا .

---

[٣٩] تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي : (٤ / ٢٥٦) .

مەبەستی ئەم زانایانە ئەوەیە كەوا هەر لە بنەڕەتدا مارەیی كچی هەتیووی بچوك دانامەزرێت تاوەكو بڵێین دواتر پێویست دەكات بە ئازادی هەڵبژاردنی بە ڕێكردن یان هەڵوەشاندنەوەی مارەكردن و بە شوودان .

وە ئیمامی (الـمباركفوري) لە شیكردنەوە و ڕوون كردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا فەرموویەتی : (مَعْنَاهُ : لا تُنْكَحُ حَتَّى تَبْلُغَ فَتُسْتَأْمَرَ قَالَهُ الْقَارِي فِي "الْمِرْقَــاةِ" ... ، «وَإِنْ أَبَتْ» مِنْ الْإِبَاءِ ، أَيْ أَنْكَرَتْ وَلَمْ تَرْضَ ، «فَلَا جَوَازَ عَلَيْهَا» أَيْ : فَلَا تَعَدِّيَ عَلَيْهَا وَلَا إِجْبَارَ)[٤٠].

واتە : مەعنای ئەم فەرموودەیە ئەوەیە : كە نابێت كچی بچوك و پێنەگەیشتوو بدرێت بە شوو تاوەكو بالغ دەبێت و پێدەگات ئەنجا پرس و ڕای پێدەكرێت ... وە ئەگەر خۆی گرتەوە و ئەوەی بە خراپ زانی و ڕازی نەبوو ، ئەوا نابێت تەعدا و ستەم و زۆری لێبكرێت .

كەواتە ئەگەر بێدەنگ نەبوو بەڵكو ناڕەزایی دەبڕی و قایل نەبوو بەو كەسەی كە خوازبێنی كردووە ئەوا نابێت بە هیچ شێوەیەك بە زۆر و بە زەبری هەڕەشە و گوڕەشە مارە بكرێت و

---

[٤٠] تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي : (٤ / ٢٥٤ ــ ٢٥٥) .

بدرێت بە شوو .

لە بەر ئەمە پێویستە لـە سـەر موسـڵمانانی سەرپەرشتـیاری كچان كەوا پـرس و ڕای تـەواو و ڕاسـت و ڕەوا بـە كـچـان بكـەن كاتێـك كە دەدرێن بە شوو بۆ ئەوەی دوو چـاری ئـەو سـەرنجامە خراپانە نەبنەووە كە باس كران !

هەروەها پێویستە لە سـەر موسـڵمانان كـەوا بـۆ مـارە بـڕین مامۆستای شارەزا و شەرع زان و بـیر ڕۆشـن و تێگەیـشتوو ببـەن بۆ مارە بڕینی ئافرەتان بۆ ئـەوەی بـە تـەواوی پـرس بـە كـچانی خوازبێنی كراو بكەن :

ئایا خوشكی بەڕێز تۆ بەم خوازبێنیكارە ڕازی و قایلیت یـان نا ؟

وە ئایا كەس زۆری لێنەكردوویت ؟ باوكت یان دایكت یان برا و مام و خزمەكانت زۆریان بە سەرتەوە نی‌یە ؟

وە ئایا ئەو (مەهر و مارەیی‌یـەی) كـە بـۆت دیـاری كـراوە و مافـی شەخصی خۆتە بە تەنها پێی ڕازی و قایلیت یان نا ؟

جا ئەگەر وەڵامی كچەكە (بلـێ) بوو یان (بێدەنگ) بوو ، ئەوا دیارە ڕازی‌یە و ئەو كاتە مارە دەكرێت و یا خوا پیرۆزی بێت .

بەڵام ئەگەر ناڕەزایی دەبڕی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ئەگەر دەستی کرد بە گریان ، ئەوا دیارە ڕازی نی‌یە و قایل نیه‌یە بەو کەسە بەڵکو فشار و زۆری لە سەرە ، ئەو کاتە نابێت مارە بکرێت و بخرێتە ژێر دەسەڵاتی کەسێکەوە کەوا کچەکە پێی ڕازی نی‌یە .

بۆیە لێرەدا ئامۆژگاری کچانی بەڕێز و خوشکانی بە ئیمانم دەکەم کەوا هەرگیزا و هەرگیز لە کاتی مارەبڕینیاندا بێدەنگ نەبن ئەگەر ڕازی نەبوون بەو کەسەی کەوا خوازبێنی کردوون یان بەو ئەندازە (مەهر و مارەیی‌یەی) کە بۆیان دیاری کراوە ، ئەگینا با دوای ئەوە گلەیی لە مامۆستایان نەکەن .

## ٢ ـ بەند کردنی کچان و مراندنی هەست و ویستیان :

ئەمەش لە چەند خاڵێکدا بەرجەستە دەبێت :

أ / بە شوو نەدانی کچان :

ئەو کچانەی کەوا دەمێننەوە و شوو ناکەن لە ڕاستیدا زۆربەیان تەنها بەس بە جەستە لە دونیادا دەژین ، ئەگینا ئەگەر پەردە لە سەر ناخی هەڵبدەیتەوە و لاپەڕەکانی ناو دڵی بخوێنیتەوە ئەو کاتە دەزانیت ئەم کچانە چەندێك هەست بە ژیان

دەكەن و بۆت ڕوون دەبێتەوە كەوا ئەمانیش ویست و حەز و هەست و نەستیان مردێنراوە !

**تاوانی ئەم جۆرە كوشتنە ناڕاستەوخۆیەی كچان دەكەوێتە ئەستۆی :**

**١ـ كچان خۆیان :**

ئەمەش لە حاڵەتێكدا بە دی دەكرێت كاتێك كچێك خوازبێنیكار دێتە داوای بەڵام كچەكە ڕەتی دەكاتەوە لە بەر چەند هۆكار و بیانویەكی نا شایستە ، لەوانە :

* هەندێك لە كچان كاتێك خوازبێنیكار دێتە داوای و خوازبێنی دەكات خۆی لێدەگۆڕێت و داخوازی هەندێك شتی مەعنەووی و مادی دەكات لە خوازبێنیكار كەوا لە ڕاستیدا شایستەی ئەوە نین ببن بە كۆسب و تەگەرە لە ڕێگای شووكردن و بنیات نانی ژیانێكی نوێ و سەربەخۆ و بەختەوەر ، لەوانە :

دەبێت خوازبێنیكار دەوڵەمەند بێت یان خاوەنی بڕوانامە بێت یان زۆر جوان و بالا بەرز بێت یان ناودار و هەڵكەوتوو بێت یان .. یان .... هتد !!!

لە ڕاستیدا ئەم جۆرە بیانووە نابەجێانە بوونەتە هۆی دواكەوتنی ــ زۆرێك لەو كچانەی كە ماونەتەوە ــ لە ژیانی هاوسەرێتی .

بەڵێ ئێمە ناڵێین : با هاوسەنگی و گونجان لە نێوان هەردوو لادا نەبێت ! بەڵكو دەڵێین : با زیادەڕەویی و فیز زلی و خۆ لێگۆڕانی تێدا نەبێت .

وە ئێمە ناڵێین : با (دكتۆرەیەك) شوو بە (كەسێكی سادە و نەخوێندەوار و زۆر ئاست نزم لە خۆیەوە) بكات ! یان ناڵێین : با (كچە دەوڵەمەندێكی بە ناز و ناسك و لە خۆشیدا ژیاو) شوو بە هەژارێكی دەست كورت بكات !

ئەمەش نەك لە بەر ئەوە بێت كە (نەخوێندەواری) یان (هەژاری) ببێت بە كۆسپ و ڕێگر لە پرۆژەی هاوسەر گرتن ، بەڵكو لە بەر ئەوەیە زۆر جارێك ئەوە جۆرە پرۆژانەی كەوا هاوسەنگی و لە ئاست یەكدا بوون و پێكەوە گونجانی تێدا ڕچاو نەكراوە فەشەل و هەرەسی هێناوە و نەبووەتە مایەی بەختەوەری هەردوو لا ، چونكە سوننەتی ژیان وا داخواز دەكات كە جۆرە هاوسەنگی و جۆرە لە ئاست یەكدا بوونێك هەبێت لە نێوان مێرد و ژندا .

بەڵام باشە چ عەیبە و نەنگی و لارییەك لەوەدا هەیە (دكتۆرەیەك) شوو بە (مامۆستایەك) بكات ؟ یان ئەگەر

(مودەریسەیەك) شوو بە (كارمەندێك) بكات ؟ یان .. یان ... هتد .

* وە هەندێك جار هەندێك لە كچان دەڵێت : من تا ئێستا بڕیاری شووكردنم نەداوە چونكە هێشتا كاتی ئەوە نەهاتووە :

ئەم بڕیارەش زیاتر لەو كچانەدا بە دی دەكرێت كە دەیانەوێت بڕوانامەیەك لە فلان كۆلێژ و فلان بواردا بە دەست بێنن !!!

بۆیە دەبینیت هەندێك لەوانە بە هۆی ئەم بیانووەوە تەمنی ئاسایی شوو كردنی بە سەر دەچێت و دواتر پەشیمان دەبنەوە بە تایبەت ئەوانەیان كە دەبن بە (دكتۆرە / طبيبة) یان ئەوانەیان كە درێژە بە بواری خوێندن دەدەن دوای بە دەست هێنانی (بڕوانامەی بەكالۆریوس)یش بە مەبەست بە دەست هێنانی (ماجستێر) و هەندێك جار (دكتۆرا)ش !!!

هەروەها ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت كەوا ئێمە پێویستیمان بە (دكتۆرە / طبيبة) و ئافرەتانی پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی بەرز و لێهاتوو نییە و ڕێگری دەكەین لە درێژەدان بە خوێندن بەڵام ئەگەر ئەمە لە سنووری مەرجە شەرعییە تایبەتمەندەكانی ئەم بابەتە دەرنەچێت !

جا یەكێك لەو مەرجانە ئەوەیە ئافرەت خۆی نەكات بە قوربانی و خۆی وەكو (مۆم) بسوتێنێت بۆ ڕووناك كردنەوەی دەورووبەری !

بەڵكو ڕچاو كردنی بەرژەوەندیيەكانی خوودی خۆی لە پێش بەرژەوەندی هەموو خەڵكانی ترەوەیە .

باشە شوو كردن كەی ڕێگە لە خوێندن دەگرێت ئەگەر ئەو خوێندنە باری دەروونی و فیسۆلۆجی و مەرجە شەرعیيەكانی خوێندنی ئافرەتانی تێدا لە پێش چاو بگیرێت ؟!!

بۆیە هەندێك جار دەبینین یان دەبیستین لەنێو ئەو كچانەدا كچی وا هەیە چەندین جار خوازبێنی كراوە بەڵام ئەم بەردەوام هەر ڕەتی كردووەتەوە تاوەكو لە كاروان بەجێ دەمێنێت و دواتر لە خەم و پەژارەدا خۆی دەخواتەوە و خۆزگە بە مردن دەخوازێت بە تایبەتی ئەگەر بكەوێتە ژێر چەپۆكەی باوەژن یان براژن ئەوا هەر ڕۆژێكی مردنێكە !!!

بۆیە ئامۆژگاری كچان بە گشتی دەكەین كەوا خۆیان بناسن و خۆیان لێنەگۆڕێت و بە كەسانێكی خاوەن ئایین و ڕەوشت بەرز و ژیر و كاسبكار و مامناوەند لەو بوارانەی پێشوودا ڕازی ببن و دواتر

خۆیان نەكەن بە قوربانی خەم و پەژارە و خۆ خواردنەوە و تانەی خەڵك بە تایبەت باوەژن و براژن !!!

## ٢ ـ سەرپەرشتیاری كچان :

ئەمەش لە حاڵەتێكدا بە دی دەكرێت كاتێك كچێك خوازبێنیكار دێتە داوای و كچەكەش پێی ڕازی دەبێت بەڵام سەرپەرشتیارەكانی (ولاة أمرها) بە بێ بیانوویەكی شایستە و بە بێ هۆیەكی زیندوو دەبن بە ڕێگر و كۆسپ لە ئاست شوو كردنی ئەو كچە و چەندین جار ئەو جۆرە هەل و دەرفەتانە كەوا زۆر دووە دووبارەببێتەوە لە دەستی دەدەن و كچی ستەم لێكراویش بەم جۆرە هەڵوێستە دڵ ڕەق ئامێز و نا بەرپرسانە دەبێت بە قوربانی ویست و ئارەزووی نالەباری سەرپەرشتیارەكەی .

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ (ﷺ) : قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) : «إِذَا خَطَبَ إِلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ إِلاَّ تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ عَرِيضٌ»[٤١].

واتە : ئەگەر كەسێك خوازبێنی كچی لێتان كرد كە ئێوە لە دین و ئەخلاق و ڕەوشتی ڕازی بوون ئەوا ژنی بدەنێ ، وە ئەگەر

---

[٤١] صحيح سنن الترمذي رقم : (١٠٨٤) .

ئەمەتان نەکرد ئەوا لە سەر زەویدا فیتنە و گەندەڵکارییەکی بەرفراوان ڕوودەدات .

وفي رواية أخرى : ((إِذَا جَاءَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَأَنْكِحُوهُ إِلاَّ تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ ، قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ وَإِنْ كَانَ فِيهِ ، قَالَ : إِذَا جَاءَكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَأَنْكِحُوهُ ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ))[٤٢] .

واتە : ئەگەر کەسێك هات و خوازبێنی کچی لێتان کرد کە ئێوە لە دین و ئەخلاق و ڕەوشتی ڕازی بوون ئەوا ژنی لێ مارە بکەن ، وە ئەگەر ئەمەتان نەکرد ئەوا لە سەر زەویدا فیتنە و گەندەڵکاری ڕوودەدات ، ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا : ئەی ئەگەر کەم و کوڕییەکی تێدا هەبوو - وەکو پارەی کەم بوو یان هاوئاست نەبوو - ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : ئەگەر کەسێك هات و خوازبێنی کچی لێتان کرد کە ئێوە لە دین و ئەخلاق و ڕەوشتی ڕازی بوون ئەوا ژنی لێ مارە بکەن [سێ جار ئەمەی فەرموو] .

کەواتە پێویستە لە سەر بەخێوکار و سەرپەرشتیاری کچان

---

[٤٢] صحيح سنن الترمذي رقم : (١٠٨٥) .

دڵسۆز و غەم خۆری ڕاستەقینەیان بن ، و دەبێت ئەوەش بزانن هەروەكو چۆن پێویستە لە سەریان خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگیان بۆ دابین بكەن ئاوایش پێویستە لە سەریان هاوسەر و مێردی هاوبەشی ژیانیان بۆ هەڵبژێرن لەو كەسە دیندار و لە خوا ترس و ڕەوشت بەرزانەی كەوا دەبنە مایەی بەختەوەری و خۆش گوزرانی دونیا و دوا ڕۆژیان .

وە بە پێچەوانەشەوە ئەوا دەبنە مایەی خۆخواردنەوە و سووتانی پەپولە دڵ ناسككەكان و هەڵوەرینی پەڕەی ئاڵی گوڵاڵەكان ! ! !

ب / دەست بە سەراگرتن و نەگێڕانەوەی ئافرەتی تۆراو یان تەڵاق دراو (تەڵاقی یەكەم و دووەم) :

یەكێكی تر لە شێوازە ناڕاستەوخۆكانی كوشتنی ئافرەتان بریتییە لە دەست بە سەراگرتن و نەگێڕانەوەی ئافرەتانی بە شوو دراو لە كاتێكدا كە لە بەر هەندێك (ناكۆكی و شەڕ و ئاژاوە) یان لە بەر هەندێك (خەلەلی فەننی) ئافرەتەكە دەتۆرێت و دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی باوكی یان برایەكی پاشان مێردەكەی دێت بیباتەوە و ئافرەتەكەش ڕازییە بە گەڕانەوە و هەردووكیان پێك

دێـن و ئاشـت دەبنــەوە بــەڵام کـە چـی دەبینیـت هەنـدێك لـە سەرپەرشتیارەکانی ـ ئەگەر هەمووشیان نەبن ـ بە بـێ هۆکارێکی شەرعی و شایستە دەبن بە ڕێگر و کۆسپ لـە ئاسـت گەڕانـەوەی ئافرەتەکە بۆ لای مێردەکەی و بۆ ناو ماڵ و منداڵی خۆی ! ! !

یان جاری وا هەیە هەر لە بەر هەمان مەبەست کێشە دروست دەبێـت و مێردەکـە خێزانەکـەی (تـەڵاق) دەدات و پاشـان ــ **بـە پێچەوانەی شەرعەوە** ــ دەری دەکـات و دەینێرێتـەوە بـۆ مـاڵی باوکی [٤٣] ، ئەنجا پاش ئەوەی کە پەشیمان دەبێتـەوە و هەست

---

(٤٣) **تێبینیەکی زۆر گرنگ :**

خوێنەری بـەڕێز : پێویـستە بزانێـت کـەوا دەرکردنـی ئـافرەت لـە ماڵەکـەی خۆی دوای تەڵاق دانی ـ جا چ بۆ ماڵی باوکی بێت یان بۆ ماڵی برایـەکی بێـت یـان بۆ ماڵی خوشکێکی بێت یان بۆ هـەر مـاڵێکی تـر بێـت جگـە لـە ماڵەکـەی خـۆی ـ **حەرامە و لە شەرعدا ڕێ‌پێنەدراوە** ! بەڵکو دەرکردنی ئافرەت لە ماڵەکەی خۆی دوای تەڵاق دانی زوڵم و ستەمە لەو ئافرەتـە دەکرێـت و سـووکایەتی کردنـە بـە هەست و کەسایەتی ئەو ئافرەتە ! و ئـەم کـارە نـەریتێکی خێڵـەکی و خوویـەکی دەشتەکییانە و هەڵوێستێکی دواکەوتووانەیە بەرامبەر بە ئـافرەت ئەنجامـدەدرێت ! بۆیـە خـوای گـەورە بـە ڕاشـکاوی لـە قورئانـدا لـە یەکـەم ئایـەتی سـورەتی (الطلاق)دا ئەم کـارەی قەدەغـە و حـەرام کـردووە و فەرموویـەتی : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُواْ ٱلْعِدَّةَ ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ ۖ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ

وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَـٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ۚ لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ﴿١﴾ [سورة الطلاق] .

واتە : ئەی پێغەمبەر و ئیمانداران ئەگەر ژنانتان تەڵاق دا ئەوا لە کاتی گونجاوی خۆیدا تەڵاقیان بدەن * و ئەو کاتانەش بزانن و بیژمێرن و لە خوای پەروەردگارتان بترسن و سەرپێچی فەرمانەکانی مەکەن و ئافرەتانی تەڵاق دراو لە ماڵەکانیان دەرمەکەن و با ئەوانیش دەرنەچن ئیللا لە کاتێکدا نەبێت کەوا ئەگەر ئافرەتەکە گوفتارێك یان ڕەفتارێکی نابەجێی ڕوونی لێوەشایەوە ، ئەمەش سنووری خوایە بۆتانی داناوە و هەرکەسێك لە سنووری خوا دەربچێت و تەعەدا بکات ئەوا زوڵم و ستەمی لە خوودی خۆی کردووە ، (با لە ماڵەکەی خۆی دەرینەکات) چوونکە لەوانەیە دوای ئەوە پەشیمان ببێتەوە .

* کاتی گونجاوی تەڵاق دان بریتی‌یە لەوەی کەوا ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدا هەبێت ئەگینا بە پێچەوانەوە ئەو تەڵاق دانە ناشەرعی‌یە و حەرامە :

١ ـ ئەبێت ئەو تەڵاق دانە لەبەر هۆکارێکی شەرعی و شایستە بێت نەك لەبەر تووڕەبوون و هەڵچوونی سەرپێیانە و سەرجادانە و هەرزەکارانە بێت ! وەکو زۆربەی تەڵاقەکانی ئەم سەردەمە !!!

٢ ـ ئەبێت ئافرەتەکە پاك بێت لە کاتی تەڵاق دانەکەدا و لە سووڕی مانگانە (بێ‌نوێژی)دا و زەیسانی‌دا نەبێت .

٣ ـ ئەبێت دوای پاك بوونەوە لە بێ‌نوێژی و پێش جووتبوون بێت ، واتە : تەڵاق دانی دوای جووتبوون ناشەرعی‌یە و ناڕەوا و حەرامە .

٤ ـ ئەبێت یەك تەڵاقی بدات نەك سێ بە سێ !!! و سێ هەزار تەڵاق و پڕ ئاسمان و زەوی ! و ... هتد !!!

بە هەڵەی خۆی دەكات دەچێتەوە داوای خێزانەكەی خۆیی و دەیەوێت بیگێڕێتەوە و ئافرەتەكەش ڕازییە بە گەڕانەوە و هەردووكیان پێك دێن و ئاشت دەبنەوە كە چی دەبینیت بە هەمان شێوە هەندێك لە سەرپەرشتیارەكانی ــ ئەگەر هەمووشیان نەبن ــ بە بێ هۆكارێكی شەرعی و شایستە دەبن بە ڕێگر و كۆسپ لە ئاست گەڕانەوەی ئافرەتەكە بۆ لای مێردەكەی و بۆ ناو ماڵ و منداڵی خۆی !!!

ئەم (دەست بە سەراگرتن و نەگێڕانەوەیە) یەكێكە لە هۆكارەكانی خۆ خواردنەوەی ئەو جۆرە ئافرەتانە و كوشتنی ویست و حەز و هەستەكانی بە تایبەت ئەگەر منداڵی هەبێت لەو مێردە .

جا لە بەر نەهێشتنی ئەم هەڵوێستە دڵ ڕەق ئامێز و ستەمكارانە خوای گەورە ئەم كارەی - تەنانەت دوای تەواو

---

كەواتە لەمەوە بۆمان دەردەكەوێت كەوا : زۆربەی ئەو تەڵاقانەی كە لەم ڕۆژگارەدا فڕێدەدرێن و ئافرەتانی پێدەچەوسێنرێتەوە و منداڵانی بەستزمانیشی پێ سەرگەردان دەكرێت ناڕەوا و ناشەرعییە و زۆر زۆر دوورە لە بنەماكانی ئیسلام و دەقەكانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەكانی پێغەمبەری ڕەحمەت و هیدایەت بۆ مرۆڤایەتی (ﷺ) .

بـوونی مـاوەی دروسـتێتی گێڕانـەوەی ئافرەتـان دوای (تـەڵاقی یەكەم و دووەم) ـ قەدەغە و حەرام كردووە و فەرموویەتی :

﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْا۟ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۗ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٢﴾﴾ [البقرة] .

واتە : ئەگـەر ئافرەتانتـان تـەڵاق داو كـاتی گێڕانـەوەیان بـە سەر چوو ئەنجا داوا كرانەوە ئەوا (دەستیان بە سـەردا مـەگرن و بەندیان مەكەن و ڕێیان لێمەگرن) بگرێنەوە و با شوو بكەنەوە[٤٤]

---

[٤٤] تێبینی : بۆ ئەوەی لـەو واتایـە تێبگـەیت پێویستە ئـەم لێكدانەوەیـەت بـۆ ڕوون بكەمەوە :

ـ ئافرەتی تەڵاق دراو (بە تەڵاقی یەكەم و دووەم) مێردەكەی دەتوانێت لەو ماوەیەدا كە لە شەرعدا دیاری كراوە بیگێڕێتەوە بە بێ هیچ مـەرجێك تـەنها ئـەوە نەبێت كە مێردەكە دەبێت بڵێت : (ئەوا من تۆم گێڕایەوە) یان بە هـەر ووتـەیـەكی هـاو شـێوەی ئەمـە ، وە ڕەزامەنـدی ئافرەتەكـە یـان سەرپەرشـتیارەكانی هـیچ ڕۆڵێكی نی‌یە لەم بوارەدا جگە لەو حاڵەتە نەبێت كەوا هۆكاری شەرعی و بەڵگـەی شایستە هەبێت بۆ نەگێڕانەوەی ئافرەتەكە .

ـ بەڵام ئەگەر مێردەكـە ئـەو ئافرەتـە تـەڵاق دراوەی (بـە تـەڵاقی یەكـەم و دووەم) نەگێڕایەوە تاوەكو ماوە شەرعی‌یە دیاری كراوەكە بە سەر دەچێت ، ئەوا

به مێردەكانیان ئەگەر به یەكتر ڕازی بوون و پێك هاتن لەنێوان یەكتردا به چاكه ، ئا ئەوه خوا ئامۆژگاریتانی پێ دەكات بۆ ئەوانەتان كه باوەڕی به خوا و به ڕۆژی دوایی هەیه ، ئا ئەوه چاكتر و پاكتره بۆتان ، وه خوا دەزانێت و ئێوه نازانن .

قال القرطبي : (﴿تَعْضُلُوهُنَّ﴾ معناه تحبسوهن ... وقيل العضل التضييق والمنع وهو راجع إلى معنى الحبس ...) .

واته : ﴿تَعْضُلُوهُنَّ﴾ مانای بەند كردن دەگەیەنێت ... وه وتراویشه : تەنگ پێهەڵچنین و ڕێ لێگرتن دەگەیەنێت ئەمەش هەر دەگەڕێتەوه بۆ مانای بەند كردن .

---

ئەگەر ویستی بیگێڕێتەوه ئەوا دەبێت سەر لە نوێ خوازبێنی بكات وەكو خەڵكانێكی تر ، هەروەها لەم حاڵەتەدا ڕەزامەندی ئافرەتەكه و هەروەها سەرپەرشتیارەكانشی مەرجه بۆ گێڕانەوەی و مەرجیشه سەر لە نوێ ماره بېڕێتەوه به مارەیی و دوو شایەتی نوێ .

جا ئەگەر دوای ئەمەش ئافرەتەكه ڕازی بوو به شوو كردن و گەڕانەوه بۆ لای مێردەكەی ئەوا نابێت سەرپەرشتیارەكانی ببنه كۆسپ و ڕێگر لە ئاست گەڕانەوەیدا تەنها مەگەر هۆكاری شەرعی و بیانوویی شایسته هەبێت بۆ نەگێڕانەوەی ئەو كاتە نابێت بیگێڕنەوه چونكه زەرەر و زیان به ئافرەتەكه دەكات .

**هۆكاری دابەزینی ئەم ئایەتەش ئەوەیە :**

عن الحسن : (أنَّ أختَ معقل بن يسار طلقها زوجُها ، فتركها حتى انقضت عدتها ، فخطبها ، فأبى معقل ، فنزلت : ﴿فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ﴾)[٤٥].

**واتە : خوشكێكی (معقل بن يسار) كە صەحابەی پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) مێردەكەی تەلاقی دا ، ئەنجا وازی لێهێنا تاوەكو ماوەی گەڕانەوەی بە سەر چوو ، پاشان خوازبێنی ئەو ئافرەتەی كردەوە ، ئەنجا (معقل) خۆی گرتەوە لەوەی كە ئافرەتەكە بگێڕێتەوە بۆی ، بە هۆی ئەمەوە ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ﴾ واتە : دەستیان بە سەردا مەگرن و بەندیان مەكەن و ڕێیان لێمەگرن لەوەی كەوا بگەڕێنەوە و شوو بكەنەوە بە مێردەكانیان .**

وعن ابن عباس (ﷺ) قال : (نزلت هذه الآية في الرجل يطلق امرأته طلقةً أو طلقتين فتنقضي عدتها ثُمَّ يبدو له أنْ يتزوجها وأنْ يراجعها وتريد المرأة ذلك فيمنعها أولياؤها من ذلك فنهى الله أنْ يمنعوها)[٤٦].

---

[٤٥] صحيح البخاري رقم : (٤٥٢٩) .

[٤٦] تفسير ابن كثير .

واتە : ئەم ئایەتە سەبارەت بەوە دابەزیوە : كەوا پیاوێك خێزانەكەی تەڵاق دەدات (تەڵاقی یەكەم یان دووەم) ئەنجا كاتی گێڕانەوەی بە سەر دەچێت ، پاشان بۆی دەردەكەوێت جارێكی تر مارەی بكاتەوە و بیگێڕێتەوە و ئافرەتەكەش ئەمەی دەوێت بەڵام سەرپەرشتیارەكانی دەبنە ڕێگر لەمە ، بۆیە خوای گەورە ئەمەی قەدەغە كردووە كەوا ڕێیان لێبگرن .

كەواتە نابێت سەرپەرشتیاری ئافرەتان بە بێ هۆكارێكی شەرعی و شایستە : ئافرەتان بەند بكەن و تەنگیان لێهەڵچنن و ڕێیان لێ بگرن لە ئاستی گەڕانەوەیان بۆ لای مێردەكانیان ، چونكە هەڵوێستێكی نا شەرعی و ستەمكارانەیە و یەكێكە لە هۆكارەكانی خۆ خواردنەوەی ئەو جۆرە ئافرەتانە و كوشتنی ویست و حەز و هەستەكانی بە تایبەت ئەگەر منداڵی هەبێت لەو مێردە .

**ج / مارەكردنی برا ژن (یان ژن برا) دوای مردنی برا وەك ئەوەی كە بە میرات بۆی مابێتەوە :**

ئەم جۆرە خوی لە خۆیدا خەسڵەتێكی سەردەمی جاهلیەت و نەفامێتی پێش هاتنی پێغەمبەرە (ﷺ) ! بەڵام بە داخەوە جارێكی تر لە نێو كۆمەڵگای موسڵمانانا بە گشتی و لە

نێو كۆمەڵگای كوردەواریشدا بە تایبەتی سەری هەڵداوەتەوە و بووە بە باو و نەریت .

خوای پەروەردگار ئەم خەسڵەتەی حەرام كردووە و فەرموویەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا .. ﴿١٩﴾ ﴾ [سورة النساء] .

واتە : ئەی ئەوانەی كە باوەڕدارن و ئیمانتان هێناوە حەڵاڵ نی‌یە بۆتان ئافرەتان بە زۆرەملێ وەكو میرات ببەن بۆ خواتان ..

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ : (كَانُوا إِذَا مَاتَ الرَّجُلُ كَانَ أَوْلِيَاؤُهُ أَحَقَّ بِامْرَأَتِهِ ، إِنْ شَاءَ بَعْضُهُمْ تَزَوَّجَهَا ، وَإِنْ شَاءُوا زَوَّجُوهَا ، وَإِنْ شَاءُوا لَمْ يُزَوِّجُوهَا ، فَهُمْ أَحَقُّ بِهَا مِنْ أَهْلِهَا ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا .. ﴿١٩﴾ ﴾)[٤٧] .

واتە : بێباوەڕەكان ئەگەر پیاوێك لە ناویاندا بمردایە ئەوا كەسوكاری و سەرپەرشتیارەكانی شایستەتر و لە پێشتر بوون بە خێزانەكەی ، ئەگەر هەندێكیان ویستیان لێ‌ببووایە بۆ خۆی مارەی دەكرد ، وە ئەگەر ویستیان هەبوایە دەیاندا بە شوو ، وە ئەگەر ویستیان هەبوایە دەیانهێشتەوە و نەیاندەدا بە شوو ، واتە

[٤٧] صحيح البخاري رقم : (٤٥٧٩) .

ئەوان شایستەتر و لە پێشتر بوون بەو ئافرەتە لە كەسوكاری خۆی ، بۆیە ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗاۖ .. ﴿١٩﴾﴾ .

واتە : ئەی ئەوانەی كە باوەڕدارن و ئیمانتان هێناوە حەڵاڵ نییە بۆتان ئافرەتان بە زۆرەملێ وەكو میرات ببەن بۆ خواتان .

وقال القرطبي : (المقصود نفي الظلم عنهن وإضرارهن ...

واتە : مەبەست ئەوەیە ستەم لە ئافرەتان نەكرێت و زەرەر و زیانیان لێ دوور بخرێتەوە ...

والمقصود من الآية : إذهاب ما كانوا عليه في جاهليتهم وألاَّ تجعل النساء كالمال يورثن عن الرجال كما يورث المال ...

واتە : مەبەست بەم ئایەتە بریتییە لە : ڕەواندنەوە و نەهێشتنی ئەو خەسڵەتەی كە خەڵكانی سەردەمی نەفامی و جاهلی لە سەری بوون ، بۆ ئەوەی ئافرەتان وەكو ماڵ و شتومەكیان لێنەكرێت كە بە میرات دابەش بكرێن بە سەر پیاواندا هەوەكو چۆن ماڵ و سامان دەبێت بە میرات ...

وإذا تنزلنا على القول بأن المراد بالخطاب في العضل الأولياء ، ففقههُ أنه متى صح في وليٍّ أنه عاضل نظر القاضي في أمر المرأة

وزوَّجها إلاّ الأب في بناته فإنه إنْ كان في عضله صلاحٌ فلا يُعترض قولاً واحداً) .

واته : ئەگەر مەبەست بەم ئایەتە سەرپەرشتیارانی ئافرەت بێت لە كەسوكاری خۆی ئەوا سوودە شەرعی‌یەكەی ئەوەیە :

كە هەر كاتێك دەركەوت سەرپەرشتیاری ئافرەتەكە ڕێگرە لە بە شوو دانی و مارە كردنی لە كەسێكی شایستە و گونجاو لە ڕووی شەرعەوە ئەوا دادوەر و قازی موسڵمانان لە بار و حاڵی ئەو ئافرەتە دەكۆڵێتەوە و پاشان ئەو دەبێتە سەرپەرشتیاری و دەیدات بە شوو ، تەنها باوك نەبێت ئەگەر ڕێگر بوو لە بە شوو دانی كچەكانی لە كاتێكدا كەوا ئەو ڕێگرتنە چاكە و سوودی تێدا هەبێت بۆیان ئەوا نابێت هیچ كەسێك ڕووبەڕووی ببێتەوە بە یەك دەنگی زانایان .

كەواتە ئەگەر ڕێگرتنەكە لە بەر هۆكارێكی ناشەرعی و نابەجێ و ناشایستە بوو ئەوا ئەم ڕێگرتنە بە ستەم و تاوان لە قەڵەم دەدرێت و ئەو كاتە دادوەر و قازی موسڵمانان ئەركی سەرپەرشتیارێتی كچانی ستەم لێكراو دەگرێتە ئەستۆی خۆی و ئەو ڕاستەوخۆ دەیاندات بە شوو .

د / ژن بە ژن :

یەكێكی تر لە شێوازە ناڕاستەوخۆكانی كوشتنی ئافرەتان بریتی‌یە لەوەی كەوا (كچێك) دەدرێت بە شوو بۆ برایەكی یان بۆ باوكی بەرامبەر بە (كچێك)ی تر ئەویش بۆ برایەكی یان بۆ باوكی! ئەمەش پێی دەوترێت (ژن بە ژن)!

لە ڕاستیدا زۆر جارێك یەكێك لەو (كچانە) یان (هەردووكیان) ناڕازین بەو جۆرە شووكردنە !!! بەڵكو بە زۆر و لە ژێر زەبری هەڕەشە و گوڕەشەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆدا دەدرێن بە (ژن) !!!

بۆیە دەبینین زۆر جارێك ئەو جۆرە (ژن هێنان و شوو كردن و هاوسەر گرتنانە)! سەرناگرن و بەردەوام نابن !!!

وە لەوانەیە هەندێك جار یەكێك لەو (خێزانانە) (ژن و پیاوەكە) لە نێوان خۆیاندا پێكبێن و ژیانیان ئاسوودە و بێ گرفت بێت ، بەڵام بە هۆی ناهەمواری و كێشە و گرفت و ناكۆكی نێوان (خێزان و ژن و مێردی) دووەمەوە ئەوانیش ژیانیان لێ تێك بدرێت و كێشە و گرفت و ناكۆكی بخرێتە نێوان ئەوانیشەوە !!!

جا لەبەر ئەو زیان و زەرەرانەی كە بە هۆی (ژن بە ژن)ەوە دەكەوێتە سەر (كچی یەكەم) یان (كچی دووەم) یان (هەردووكیان)ەوە لەبەر ئەوە لە ئیسلامدا (مارە كردنی : ژن بە ژن) دروست نییە ! بەڵكو حەرام و رێپێنەدراوە !

بەڵگەش بۆ سەلماندنی ناشەرعێتی (ژن بە ژن) بریتییە لەم فەرموودانەی خوارەوە :

١ ـ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (ﷺ) قَالَ : أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : «لاَ شِغَارَ فِي الإِسْلاَمِ»[٤٨].

واتە : (ژن بە ژن) نییە لە ئیسلامدا .

٢ ـ وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ : أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) : «نَهَى عَنِ الشِّغَارِ»[٤٩].

واتە : پێغەمبەر (ﷺ) (ژن بە ژن)ی قەدەغە كردووە .

٣ ـ وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) : «نَهَى عَنِ الشِّغَارِ ، قَالَ : وَالشِّغَارُ أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ زَوِّجْنِي ابْنَتَكَ وَأُزَوِّجُكَ ابْنَتِي ، أَوْ زَوِّجْنِي أُخْتَكَ وَأُزَوِّجُكَ أُخْتِي»[٥٠].

---

[٤٨] صحيح سنن الترمذي رقم : (١١٢٣) وصحيح سنن النسائي رقم : (٣٣٣٥) ، وقد جاء أيضاً من حديث أنس وابن عمر (ﷺ) .

[٤٩] صحيح البخاري رقم : (٥١١٢) وصحيح مسلم رقم : (١٠٣٤) .

واته : پێغەمبەری خوا (ﷺ) (ژن به ژن)ی قەدەغە كردووه ، فەرمووی : (ژن به ژن)یش بریتی‌یه لەوەی كه پیاوێك بڵێت به پیاوێكی تر : كچەكەتم لێ‌ماره بكه منیش كچەكەمت لێ‌مارەدەكەم ، یان دەڵێت : خوشكەكەتم لێ‌ماره بكه منیش خوشكەكەمت لێ‌مارەدەكەم .

ئەم فەرموودانه هەموویان بەڵگەن له سەر حەرامێتی و نادروستێتی مارەكردنی (ژن به ژن) له ئیسلامدا !

چوونكه (ژن به ژن) دەبێته هۆی زۆر كردن له (ئافرەتان) بۆ شووكردنیان به كەسانێك كه ویست و ئارەزوویان له سەر نی‌یه ! ئەمەش تەنها له بەر پێشخستنی بەرژەوەندی سەرپەرشتیارەكەی به سەر بەرژەوەندی (ئافرەتان)ەوه ! وه ئەمەش تاوان و ستەمه له (ئافرەتان) دەكرێت !

هەروەها (ژن به ژن) دەبێته هۆی بێ‌بەش بوون و مەحرووم بوونی (ئافرەتان) له مارەیی ئافرەتانی هاوشێوازیان !

چوونكه لەوانەیه یەكێك لەو (ئافرەتان)ه كه دراوه به (ژن) شایستەی مارەیی‌یەكی زیاتر بێت له بەرامبەرەكەی به هۆی

---

[٥٠] صحيح مسلم رقم : (١٠٣٥) .

هه‌ندێك ئیعتیباره‌وه ، به‌ڵام له به‌ر ئه‌وه‌ی (سه‌ر به سه‌ر !!!) ئاڵوگۆڕی پێ كراوه ده‌بێت هه‌رچی‌یه‌كی پێدرا قه‌بوڵی بكات !

هه‌روه‌ها زۆر جارێك (ژن به ژن) دوای گواستنه‌وه‌یان سه‌ر له كێشه و ناكۆكی‌یه‌وه ده‌رده‌كات !

هه‌روه‌ها زۆر جارێك (ژن به ژن) (طه‌لاق به طه‌لاق)ی به دوادا دێت !

وه ئه‌مه‌ش به‌شێكه له سزا پێشخراوه‌كانی ئه‌و كه‌سانه‌ی كه به پێچه‌وانه‌ی شه‌رعه‌وه ڕه‌فتار ده‌كه‌ن[٥١] !

كه‌واته : ئه‌مه‌ش شێوازێكه له شێوازه ناڕاسته‌وخۆكانی كوشتنی ئافره‌تان !

چوونكه ویست و مافی هه‌ڵبژادنی هاوسه‌رێتییان سه‌ركووت ده‌كرێت و ده‌بنه قوربانی به‌رژه‌وه‌ندی خۆیی سه‌رپه‌رشتیاره‌كانیان !!!

لێره‌دا دێینه كۆتایی بابه‌ته‌كه‌مان كه به كورتی پێك هاتبوو له :

ـ ده‌رخستن و ئاشكراكردنی ئه‌وه‌ی كه **(ناڕه‌زایی ده‌ربڕین**

---

[٥١] انظر كتاب : (حكم السفور والحجاب ونكاح الشغار) للشيخ ابن باز رحمه الله .

بەرامبەر بە لە دایك بوونی كچان) لە خەسڵەتەكانی سەردەمی جاهلی كۆن و ئێستایشه .

ــ دەرخستن و ئاشكراكردنی ئەوەی كەوا ئەم خەسڵەته گەورەترین ستەم و تاوانه دەرحەق بە كچان .

ــ دەرخستن و ئاشكراكردنی ئەوەی كە ئەم خەسڵەتە گەندەڵ ئامێزە جارێكی تر لەم سەردەمەدا سەریهەڵداوەتەوە بە چەندین شێوازی جۆراوجۆر .

ــ دەرخستن و ئاشكراكردنی شێوازی كوشتنی كچان لە سەردەمی جاهیلی‌یەتی كۆن و شێوازە نوێكانی لە سەدەی پێشكەوتووی بیست و یەكدا !!!

ــ دەرخستن و ئاشكراكردنی شێوازە ناڕاستەوخۆكانی كوشتنی كچان لەم سەردەمەدا .

*** تێبینی‌یەك :**

لەوانەیە كەسانێك بڵێن باشە ئەم خاڵەی كۆتایی (شێوازە ناڕاستەوخۆكانی كوشتنی كچان) چ پەیوەندی‌یەكی بەم بابەتەوە هەیە ؟ لە وەڵامدا دەڵێین :

لە ژیانی دونیادا دوو جۆر مردن و كوشتن هەیە :

١ ـ مردن و كوشتنێكی بەر چاو كە بریتی‌یە لە دەرچوونی

گیانی مرۆڤـ و لە جووڵە كەوتن .

٢ ـ كەسانێكی تر هەن بە جستە و جووڵە لە ژیاندان ! بەڵام لـەر بـەر ئـەوەی ویـست و حـەز و نەفـسیان ژێـر خـراوە و كـپ كراوەتەوە ئەوا هەست بـە جۆرێك لـە جۆرەكانی مردن دەكـەن بۆیە دەبینیت زۆرێك لەوانە خۆزگە بە مردن دەخـوازن و هەنـدێك جار هەندێكیشیان بە مەبەست خۆ رزگار كردن لە ژیانی پـڕ ئـازار و ناڕەحـەتی و كولەمـەرگییان پـەنا دەبەنـە بـەر خـۆ كوشـتن و **خۆسووتاندن** !!!

ئەمـە ڕاسـتییەكـە ئێمـە بـە چـاوی خۆمـان دەبینـین و بـە گوێی خۆشمان دەیبیسین !!!

فلا حولَ ولا قوةَ إلاّ بالله ...

# كۆتایی

لە كۆتایدا دەڵـێـم :

- ئەم نووسراوە بەرگیرییە لە هەستی كچان و داكۆكییەكی ڕاستەقینەیە لە مافە شەرعی و ڕەواكانیان .

وە سەرباسی (**فەزڵ و گەورەیی پاداشـتی بـە خێـوكردنی كچان**) و ئەو فەرموودە پیرۆزانەی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) كە لە ژێر ئەم ناونیشانەدا باس كراون سومبڵی ڕازاوەی ئەم بابەتەن .

- وە ئامۆژگاری ئافرەتان بەگشتی و كچانیش بە تایبەتی دەكەم كە زۆر بە گەرمی و لێهاتوییەوە ڕوو لە زانستی شەرعی بكەن و هەوڵی فێربوون و فێركردنی بدەن لە ڕێگای : خوێندنی دەرسی شەرعی و گوێ گرتن لە كاسێت و خوێندنەوەی كتێب و نامیلكەی زانایانی سەلەف و فێرخوازانی زانستی شەرعی ئەهلی سوننە و جەماعە كە (**ڕێگای ڕاست**)[٥٥] بۆ خەڵك ڕوون دەكەنەوە.

---

(٥٥) وە ئامۆژگاری خوێنەری بەڕێز دەكەم كە هەوڵ بدات هەموو ژمارەكانی (**گۆڤاری ڕێگای ڕاست**) و (**زنجیرەی ڕێنماییەكانی ڕێگای ڕاست**) و (**زنجیرەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە**) و (**زنجیرەی بیروباوەڕی كۆمەڵی ڕزگاربوو و سەركەوتوو**) و (**زنجیرەی ئیسلام و لاوان**) و (**زنجیرەی ئافرەت لە سایەی ئیسلامدا**) بە دەست بخات بۆ ئەوەی كتێبخانەكەی بەهرەمەند و دەوڵەمەند بكات بەو گۆڤار و كتێب و نامیلكانەی كە (**ڕێگای ڕاست**)ی بۆ ڕوون دەكەنەوە.



﴿ وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَٰئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ [ التوبة : ٧١ ] .

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته ...

نووسەر
محمد عبد الرحمن لطيف
ووتار خوێنی مزگەوتی ( عەلی كوڕی ئەبو طالب )
بەكالۆریۆس لە زانستە شەرعیيەكاندا
ژمارەی مۆبایل : ( ٠٧٧٠١٩٨٨٦٢٣ )
كەلار / كوردستان

* دەتوانیت هەموو بەرهەمەكانی نووسەر و ئەو كتێبانەی كە ئاماژەی بۆ كراوە لە هەردوو سایتی : (ڕێگای ڕاست) و سایتی (بەهەشت)دا بخوێنیتەوە :

www.r-rast.com
www.ba8.org

خوێنەری بەڕێز :

ئەگەر هەر تێبینییەك یان پرسیارێكت هەبوو سەبارەت بە ناوەڕۆكی ئەم كتێبە ئەوا پەیوەندی بكە بەم ژمارەیەوە : (٠٧٧٠١٩٨٨٦٢٣) .

# گرنگترینی سەرچاوەكان

١ ـ **قورئانی پیرۆز .**

٢ ـ تفسير ابن كثير

٣ ـ تفسير الطبري .

٤ ـ تفسير فتح القدير للشوكاني .

٥ ـ صحيح البخاري ، وفتح الباري شرح صحيح البخاري للحافظ ابن حجر العسقلاني .

٦ ـ صحيح مسلم ، وشرح صحيح مسلم للنووي .

٧ ـ صحيح سنن الترمذي ، وتحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي للعلامة المباركفوري .

٨ ـ صحيح سنن أبي داود ، وعون المعبود بشرح سنن أبي داود للعلامة شرف الحق العظيم آبادي .

٩ ـ صحيح سنن النسائي .

١٠ ـ صحيح سنن ابن ماجه .

١١ ـ صحيح الجامع الصغير .

١٢ ـ صحيح الأدب المفرد .

١٣ ـ سلسلة الأحاديث الصحيحة .

١٤ ـ النهاية في غريب الحديث لابن الأثير .

١٥ ـ لسان العرب .

ـ وغيرها من المصادر التي ذكرتها في الحواشي ...

# ناوەڕۆك

## لە بەرهەمەكانی دانەر

١ ـ سێ بنچینەكەی بیروباوەڕ و بەڵگەكانیان ـ چاپی شەشەم ـ .
٢ ـ بیروباوەڕت وەربگرە لە قورئان و سوننەت ـ چاپی چواردەیەم ـ .
٣ ـ پوختەیەك لە بیروباوەڕی ئیسلامەتی ـ چاپی شەشەم ـ .
٤ ـ كورتەیەك لە فیقهی سوننەت و قورئانی ئازیز ، كە بریتییە لە وەرگێڕانی كتێبی : (الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز) ـ ئامادە دەكرێت بۆ چاپ ـ .
٥ ـ برایەتی نێوان موسڵمانان .... ـ چاپی شەشەم ـ .
٦ ـ لەگەڵ كێدا دادەنیشیت و هاوڕێیەتی كێ دەكەیت ؟ ـ چاپی نۆیەم ـ .
٧ ـ چۆنێتی قوربانی كردن لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ـ چاپی چوارەم ـ .

٨ ـ كاتی پارشێو و بەربانگ كردن لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ـ چاپی چوارەم ـ .

٩ ـ حوكم و ئادابەكانی قەرزدان و قەرزكردن و قەرزدانەوە .. ـ چاپی دووەم ـ .

١٠ ـ فەتوای گەورە زانایانی هاوچەرخی ئەهلی سوننە و جەماعە سەبارەت بە حوكمی حزبایەتی و جیاوازی و پارچە پارچەگەرێتی ـ چاپی دووەم ـ .

١١ ـ لە ئیسلامدا چەندین گروپ و حیزب نییە بەڵكو كۆمەڵی موسڵمانان و خەلیفە هەیە ـ چاپی یەكەم ـ .

١٢ ـ حوكمی كۆمەڵ و حزبە ئیسلامییەكان لە نێو كۆمەڵگای موسڵمانانندا / فەتوای هەردوو شێخ : (ابن باز) و (ابن العثيمين) ـ چاپی یەكەم ـ .

١٣ ـ ئایا لەم دەرگایەت داوە ؟) ـ چاپی شەشەم ـ .

١٤ ـ فەزڵ و گەورەیی و حوكمەكانی دە ڕۆژی یەكەمی مانگی حاجیان لە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەردا (ﷺ) ـ چاپی شەشەم ـ .

## * زنجیرەی ئافرەت لە سایەی ئیسلامدا :

١٥ ـ یەكەم : ئافرەتان و فێربوونی زانستی شەرعی ـ چاپی هەشتەم ـ .

١٦ ـ دووەم : زانا ترین ئافرەتی دونیا ـ چاپی هەشتەم ـ .

١٧ ـ سێیەم : لە دایك بوونی كچان و ... !!! ـ چاپی حەوتەم ـ .

## * زنجیرەی بابەتە مەنهەجی یەكان :

١٨ ـ یەكەم : گەڕانەوە بۆ لای زانایانی ئەهلی سوننە پارێزەرە لە تیاچوون و گومڕابوون ـ چاپی دووەم ـ .

١٩ ـ دووەم : لە بنەماكانی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە : خۆشویستنی زانایان و بە چاكە باسكردنیانە .... ـ چاپی یەكەم ـ .

٢٠ ـ سێیەم : زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعەی سەردەم دەڵێن : حزبایەتی بیدعەیە ـ چاپی یەكەم ـ .

# ئەم کتێبە

منداڵ چ کوڕ بێت یان کچ بەخشیش و نیعمەتێکی خوایە دەیبەخشێت بەباوك و دایك ، بۆیە [illegible]یستە لەسەریان شوکری خوای بەخشندە بکەن لە بەر[illegible]دا ، ئەمەش بە بێ جیاوازی کردن لە نێوان کوڕ [illegible] کە هەردووکیان هەر بەشی خوان.

بەڵام [illegible] دەخشێنیت بەلاپەڕەکا[illegible] و ئێستای هاوچەرخیشد[illegible] کەمژەو دواکەوتوو کاتێك هەوا[illegible] کچیان پێ دەدرێت ڕوومەتیان ڕەش هەڵدەگە[illegible] مەس[illegible] بە شەرمەزاری دەکەن!!!

بۆیە ئایینی [illegible]ی ئیسلام ئەم خەصڵەتە دزێوەی ڕەد کردووەتەوە و بەخراپترین ڕەوشتی ناوزەند کردووە ، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو کچانی بەدڵخۆشکار و سەنگین لەقەڵەم داوە...

www.ba8.org

ژمارە سپاردنی (٢١٢)ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ دراوە